بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى أَشْرَفِ الْمُرْسَلِينَ ، نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ ﷺ ، وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَمَنْ اتَّبَعَهُ بِإِحْسَانٍ إِلَى يَوْمِ الدِّينِ ، أَمَّا بَعْدُ:

سوپاس بۆ نەفسی الله ی خاوەن سیفەتی بەرز و پیرۆز و گەورە و تەواو ، الحمد بۆ ئەو زاتەی چاودێری دروستکراوەکانیەتی و بەدوچاوی خۆی دەیان بینێت لەسەرو عەرشەکەی بەزاتی خۆی ، وە لەگەڵ هەمومانە بە زانستە بێ کۆتاکەی ،حمد و شوکر بۆ ئەو زاتە خاوەن ڕەحمەتە زۆرەی کە کۆتایی هەموو شەوێک دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا و بەندەکانی بانگەکات بۆ لێخۆشبونیان ، سوپاس بۆ ئەو پەرستراوەی هیدایەتی داین بۆ ناسینی ناو و سیفاتە جوانەکانی.

ئەزیزانی من گەورەترین ڕێگای بەختەوەری و ئارامترین هۆکار بۆ ئاسودەیی مرۆڤ لە دونیا و قیامەت بریتیە لە ناسینی الله و گوێڕایەڵی کردنی و بەندایەتی بۆ کردنی وەک ئەوەی داوای لێکردوین ، گەورەترین نیعمەت بریتیە لە ئیسلامەتی ، وە لە ڕاستیدا هیچ کات مرۆڤ ناتوانێ وەک پێویست بەندایەتی الله بکات گەر وەک پێویست نەیناسیبێت ، بۆیە ناسینی الله ڕێگای باشتر عیبادەت بۆ کردنیەتی ، یەکێک لەوڕێگایانە و باشترین ڕێگا بۆ ناسینی الله بریتیە لە ناسینی ناو و سیفاتەکانی ، کاتێک سیفاتەکانی الله مان ناسی ئەوجا زیاتر هەست بە گەورەیی الله دەکەین باشتر بەندایەتی بۆ دەکەین ، بۆیە پشتیوان بە الله ی خاوەن سیفاتی

جوان چەند بنچینەیەک دەخوێنین لە ناو و سیفاتی الله بۆ ئەوەی الله بناسین وەک ئەوەی خۆی داوای کردووە.....



- خوێندنی ئەم بنچینانە لەسەر ڕێڕەوی ئەهلی سونەیە لە ئیمان بونیان بە ناو و سیفاتی الله جل جلاله.
- ئەسڵی ئەم کتابە بریتیە لە زنجیرە وانەیەکی دەنگی ، بەڵام لەبەر گرنگی باسەکە و پێویست بونی کراوەتە ئەم کتێبە و نوسراوەتەوە لەلایەن کۆمەڵێ قوتابی الله پاداشتیان بداتەوە .

طارق الكردی ٢٥ شعبان ١٤٤٢

# ڕونکردنەوەی چەند دەستەواژەیەک

التحریف : لادانی وتە لە زاهیری خۆی ، واتە : گۆڕینی واتا بە لێکدانەوەیەک کە قسەکەر مەبەستی ئەوە نییە.. الله دەفەرموێت : (یحرفون الکلم عن مواضعه)

تەحریف ـیش دوو جۆرە : یان گۆڕینی واتاکەیەتی یان گۆڕینی لەفظەکەیەتی....

بۆ نمونە بڵێیت : دابەزینی الله واتە دابەزینی ڕەحمەتی ، یان دەست واتە ڕەحمەت...!



تعطیل : تەرک و چۆڵ کردن ، الله دەفەرموێت : (وبئر معطلة) ئەوانەی ئینکاری سیفاتی الله دەکەن ناونراون بە معطله چونکە سیفەتە کەمالەکانی الله نەفی دەکەن و دەڵێن خاوەنی ئەم سیفەتانە نییە ، واتە تەرکی دەکەن بۆ الله.

بۆ نمونە بڵێ : الله دەستی نییە الله نابینێت الله قسە ناکات..!!



الكيف : گەڕان بەدوای نهێنی سیفەتەکان و چۆنایەتی ئەم سیفەتانە ، سەلەف ڕێگریان لەمە کردوە چونکە پرسیارکردن لە چۆنیەتی سیفەتەکە زانست بون بە وەصف کراوەکە کە الله ـیە پێویست دەکات. وەک ئەوەی پرسی : الله چۆن دەبیستێت؟ چۆن دادەبەزێت ؟ چۆن تورە دەبێت ؟....



التمثیل : بریتیە لەوەی سیفەتەکانی الله بچوێنی بە سیفەتی مەخلوقات وەک بڵێی : بیستنی الله وەک بیستنی منە یان دەستی الله وەک دەستی دروست کراوەکانە...!



## بنچینەی یەکەم :

### لا مجال للعقل في الغيبيـات

واتە : ئەڵێین مەجال بۆ عەقڵ وە بەکارهێنانی عەقڵ نیە لە بابی غەیبیات لە بابی غەیبیاتدا مەجال بۆ عەقڵ نیە ، ئەی عەقڵ ئیشی چییە ؟ عەقڵ ئیشی تەسلیم بوونە وە بڕواپێکردنی وەحییەکەیە وە شوێن کەوتنیەتی ، عەزابی جەهەنم ، نعیمی بەهەشت ، عەزابی قەبر ، عالەمی ملائیکە ، هەموو ئەمانە بابەتی ئەسماء وسیفات ئوموری غەیبییاتن بابی غەیبین ، کەواتە لێرە کەوابوو هەموو ئەوانە ئوموری غەیبیاتن بە نیسبەت ئێمەوە ، وە یەکێکیش لە سیفەتی ئیمانداران کە الله سبحانە وتعالى وەسفیان دەکات { الذين يؤمنون بالغيب } ئەبو عالیە لە تەفسیرەکەیا دەفەرمووێت ( ئیمان بە الله سبحانە وتعالى بە ملائیکە تاکۆتایی بەڕۆژی دوای بە بەهەشت بە جەهەنم ئەوانەی کە باسمانکرد ئیمان بوون بەوانە سیفەتی ئیماندارە ) بۆ ؟ چونکە ئەوانە ئوموری غەیبیاتن ، کەواتە لە بابەتی غەیبیاتدا نابێ ئینسان بە عەقڵ شتەکان هەڵسەنگێنێت و پێوەریبکات ، عەقڵ بۆچییە ؟ بۆ شوێنکەوتنە شوێن کەوتنی وەحییەکەیە نەک موستەقیل بیت و ئیبتیدائیبیت ، مەجالی عەقڵ بوونی هەیە بەڵێ ئینکاری ئەوە ناکرێت ، چونکە ئینسان عەقڵی نەبوو الله تعالى فیکر و عەقڵی لێ سەندووە تەکلیفی لەسەر نامێنێ بەڵام عەقڵ

مەجالی بۆهەیە بەڵام مەجالێکی شوێن کەوتەیی کە شوێن کەوتەیی قورئان و سونەت بێت شوێنکەوتەی وەحی بێت نەک موستەقیل و ئبتیدائیبێت ، عەقڵ ببێتە سەنگی مەحەک ئەوەیی کە عەقڵ تەقەبولی نەکات ئەمە وەرنەگرێت ئەوەی عەقڵ ئێی باش نەبێت وە ئەوە وەرگرێت ئەگەرچی پێچەوانەی قورئان و سونەتیش بێت یان لەگەڵ قورئان و سونەتدا نەگونجێ کەوابوو بنچینەی یەکەم دەڵێت :

[ مەجال نییە بۆ عەقڵ لە بابی غەیبیاتدا ] بڕوام بە الله سبحانه وتعالی نیە چونکە نایبینم ، بڕوام بە بەهەشت نییە چونکە نایبینم ، بڕوام بە عەزابی قەبر نییە چونکە قەبرێک هەڵدەیینەوە ئەگەر بچین مردوویەک دەربێنین نایبینین عەزاب ئەدرێ ، ئەڵێین ئەمانە بابی غیبیاتن عەقڵ لێرەدا ئیشی تەسلیم بوونە نەک ئیشی حوکم دانبێت لەسەر ئەو نقڵەی کەهاتووە ، ئەو حەدیثە ئەو ئایەتە ، بەڵکو ئیشی ئەوەیە تەسلیم بێت .

## بنچینەی دووەم :

### كل فهم في الأسماء و الصفات على خلاف فهم السلف فباطل

واتە : هەموو فەهمێک هەموو تێگەیشتنێک لە ئەسماء و سیفاتدا بە پێچەوانەی ئەو تێگەیشتنەی کە سەلەف رحمهم الله تێیگەیشتون صحابە تێگەیشتووە تابعین و ئەتباعی تابعین تێگەیشتوون مەقبول نییە و وەرناگیرێ ئەوان چۆن لە ئەسماء و سیفات تێگەیشتبوون ئەبێت ئێمەش بەوچەشنە لێی تێبگەین ، کەوایە دەڵێین هەموو بیناکردنی فەهمێک دەربارەی ئەسماء و سیفاتی الله سبحانە وتعالى بەپێچەوانەی ئەوەی کە ئەو جیلە مووبارەکانە تێیگەیشتبوون باطیلەو وەرناگیرێ ، خەواریج بۆ نمونە دەلیلیان لابوو بەڵام گومڕابوون لە تەئویل و تەفسیری ئایەتەکەدا ئەوانەی کە هاوبەشی بۆ الله سبحانە وتعالى بڕیاردەدەن ، قەبر دەپەرستن دار دەپەرستن ڕەنگە لێیان پرسیت کۆمەڵێک بەڵگەت بۆبێنن بە نەسی قورئان لەسەر ئەو شیرکەی کە ئەنجامی دەدەن ، بەڵام هەڵەکەیان لە کوێدایە لە فەهمەکەدایە ، چونکە فەهمی صحابە و سەلەف یان وازلێهێناوە ئەیانەوێت خۆیان تێبگەن لە قورئان و سونەت ئیشی پێبکەن بەتێگەیشتنی خۆیان مووعتەزیلە ، جەهمی ، سەلەف کاتێک کە قسەیان لەگەڵ جەهمیەکاندا دەکرد بۆ نمونە موناظرات ڕویدەدا ئەو فەهمە سەقەتەی کە خۆیان تێیگەیشتبوون لە ئەسماء و سیفات بەڵگەی

قورئان و سونەتیان پێ بوو بە قورئان قسەیان دەکرد بەڵام فەهمەکەیان سەقەت بوو بەو فەهمە نەیان دەوت وە بەوفەهمە تێنەگەیشتبوون کە صحابە لەم ئایەتانە تێگەیشتبوون کە رسول الله گەیاندبووی صلی الله علیه وسلم ، کەوایە هەموو فیرەقێکی گومڕا هەموو فیرەقێک لە دەلیلا پێکاویانە بەڵام لە چیا گومڕابوون لە لێکدانەوە و تەئویل و تەفسرەکەیدا کە ئەگەر بچینە کرۆکی بابەتەکە زۆر هەڵدەگرێت بۆنمونە کاتێک جەهمیەکان دەڵێن : ( قورئان مەخلوقە ) ئەڵێن بە بەڵگەیی ئەم ئایەتانە دەڵێن قورئان مەخلوقە ، بەڵام ئایا صحابە بە بەڵگەیی ئەو ئایەتانە گوتیان قورئان مەخلوقە ؟ نەخێر هەر بە بەڵگەیی ئەو ئایەتانە فەرمویان قورئان کەلامی الله سبحانه وتعالی و مەخلوق نیە یان موعتەزیلە یان موشرکین ، تەبعەن موشرکینی ئەوانەیی کەخۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام باسی ئەوانە دەکەین ، لەم سەردەمە ـشدا کە لێیان دەپرسی دەڵێن : بە بەڵگەیی ئەم ئایەتە ئێمە هاوبەش بۆ الله تعالی بڕیاردەدەین بەڵام خۆی ناوی نانێن شیرک ناوی دەنێن عیبادەت بۆ الله سبحانه تعالی ، بەڵام ئەڵێین لە کوێدا نەیان پێکاوە لە فەهمەکەیاندا نەیان پێکاوە لە تەفسیرەکەیدا نەیانپێکاوە بۆ ؟ لەبەر ئەوەیی بەو فەهم و تەفسیرە لێی تێنەگەیشتوون کە صحابە و سەلەف لێی تێگەیشتبوون ، کەواتە بۆ بنچینەی دووەم دەڵێین [ هەموو فەهمێک لە ئەسماء و سیفاتدا بەپێچەوانەیی فەهمی سەلەف باطیلە و وەرناگیرێت ]

{ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ}, { ما مَنعك أن تسجُد لما خلقت بيدىّ }، كاتێک که دەڵێین : الله سبحانه وتعالى دەستی هەیە ، سەلەف وتوویانە ( یَد ) بە واتای دەست دێت ، تەواو زاهیری وەردەگرین ، کەسێکی کە دێت دەڵێت ( یَد ) بەواتای قووەت دێت بە واتای هێز دێت ئەڵێین ئەمە باطیلە بۆ ؟ لەبەر ئەوەی فەهمەکە بەفەهمی صحابە و سەلەف و صحابە نەهاتووە.

## بنچینەی سێهەم :

لا يقاس الغائب على الشاهد في باب الغيبات

واتە : ئەڵێین غائیب قیاس ناکرێتە سەر شاهید ، واتە ئەو شتەی کە نادیارە غائیبە قیاسی ناکەیتە سەر ئەو شتەی کە دەی بینیت و بەرجەستەیە لە بابی غەیبیاتدا .

سیفەتی استوی الله تعالی بەرزبوونەوە و جێگیربوون بۆسەر عەرش بۆ سەروو ئاسمانەکان تەبعەن ئاسمانی حەوتەم وە لەوێشەوە بۆ سەر عەرش ، کە ناڵێین ئەم سیفەتی ئستیوایە قیاس دەکەین بە ئستیوای مەخلوقین ئەوەی کە لەژیانماندا دەی بینین ،چونکە ئیستیوا یانی بەرزبوونەوە کاتێک کەسێک لە نزمەوە بەرزدەبێتەوە بۆ شوێنێکی بەرز ئستوايی پێ دەوترێت ، بەڵام ئایا ئەم ئستیوا کە ئستوایی الله سبحانە وتعالی یەو غەیبە بەنیسبەت ئێمەوە ئایا دەبێت قیاسی کەینە سەر ئەوەی کە لە ژیانماندا دەیی بینین کەسێک بەرز دەبێتەوە ؟ مەخلوقێک بەرز دەبێتەوە بۆ جێگایەکی بەرز ؟ نەخێر ئەمە قیاس ناکرێت بەوە ، ڕاستە واتاکانیان یەکە بەڵام سیفەتەکە جودایە .

( يَد ) ( يَد )ی غائیب قیاس ناکرێت بە دەستێک ( يَد ) یێک کە دەیبینی ئەو قیاسە باطیلە جائیز نییە ، ناکرێ کاتێک کە دەڵێین الله سبحانە وتعالی دەستی هەیە و ئینسانیش دەستی هەیە..!! کەواتە دەڵێین مادەم هەردووکیان ناویان دەستە کەواتە وەکو یەک وان ،

نەخئر ، دەڵێین ئەم قیاسە باطیلە ، ناکرێ ئەوەی غەیبە بەنیسبەت ئێمەوە قیاسی بکەینە سەر ئەوەی کە دەیبینین هەڵەیە ، ئەو قیاسە باطیلە ،چونکە غەیبێکت قیاس کردووەتە سەر شتێک کە دەیبینیت ، تۆ ئەوەی کە نایبینی و غەیبە بە نیسبەت تۆوە نازانی سیفەتەکە چۆنە کەواتە قیاس کردنەکەشت باطیلە .

## بنچینەی چوارەم :

الإتفاق في الأسماء لا يستلزم الإتفاق فی الصفات

واتە : ئەڵێین کۆکبوون و ئیتیفاقبوون لەناودا وا پێویست ناکات لە سیفاتیشا وەکویەک وابن ، واتە ئەگەر دوو ناومان هەبوو هەمان ناوبوو واتایی ئەوەنیە سیفەتەکەش وەکویەک وابێ .

( لله المثل الأعلى ) ئینسان لوتی هەیە فیل یش لوتی هەیە ئایا هەردووکیان ناویان لوتە یان نا ؟ بەڵێ ، ئایا سیفەتی ئەم لوتە وەکو ئەو لوتە وایە ؟ قەبارەیان وەکو یەک وایە ؟ شێوازی هەناسە دانیان وەکو یەک وایە ؟ درێژیان بارستاییان پانیان وەکو یەک وایە ؟ نەخێر ، کەواتە ڕاستە ناوەکانیان یەکە بەڵام سیفەتەکەیان جیایە جیاوازە ، ئینسان باڵی هەیە مێشولەش باڵی هەیە ( جَناحَ الذُّلِ من الرَّحمة ) ( جَناحَ ) باڵ ، ئایا باڵی مێشولە وەکو باڵی ئینسان وایە ؟ الله سبحانە وتعالی ئەبیستێ ئینسانیش دەبیستێ ئایا بیستنی الله سبحانە وتعالی وەکو بیستنی ئینسان وایە ؟ نەخێر ، ڕاستە ناوەکانیان یەکن ، بەڵام سیفەتەکان جیان ، الله سبحانە وتعالی پێی هەیە دەستی هەیە پەنجەی هەیە ، بەڵام ئایا پەنجەی الله سبحانە وتعالی وەکو پەنجەی ئێنسان وایە ؟ نەخێر ، تەنها ناوەکان یەکسانن بەڵام سیفەتەکان مەرج نییە یەکسانبن ، وەکو نمونەکەی هێنامانەوە ، الله سبحانە وتعالی دەستی هەیە ئینسانیش دەستی هەیە

بەڵام ناوی دەستی الله سبحانه وتعالى هەردووکیان ڕاستە ، بەڵام ئینسان وانیە ، الله سبحانه وتعالى ڕوخساری هەیە ئینسانیش ڕوخساری هەیە بەڵام ئایا وەکو یەک وان ؟ نەخێر ، ناویان وەک یەک وایە بەڵام مەرج نییە سیفەتەکە وەکو یەک وابێت ، کە گیشتینە سەر ئەم سیفەتانە باسی دەکەین کە جێگیرکراون بۆ الله سبحانه وتعالى ..

## بنچینەی پێنجەم :

### الإتفاق في الاسمي الكلي المطلق لايستلزم

### الإتفاق بعد الإضافة و التقيد و التخصيص

واتە : ئەڵێین ئیتیفاق بوون هاو واتابوون لە ناوێکی کولیا بە موطلەق بەکار هات وا پێویست ناکات هاو واتاش بن لەدوای ئەوەیی کە بە تەقیدی و بە تەخصیصی بەکارهات .

یانی چی ؟ بۆ نمونە کاتێک دەوترێت [ بیستن ، دەست ، بەرزبوونەوە ، دابەزین ] ئەمە بۆ هەموو مەخلوقاتێک بەکاردێت بۆ هەموو ئینسانێک بەکاردێت بۆ [ جن ، بۆ ئینس تەنانەت بۆ ئاژەڵیش ] بۆ نمونە : کاتێک وتت ( بیستن ) ئینسان دەبیستێ ، جنۆکە دەبیستێ ، نێر دەبیستێ ، مێ دەبیستێ ، حەیوانات دەبیستێ ، بەڵام کەوتت ] بیستنی ئینسان ] لەگەڵ [ بیستنی حەیوانات ] ئەم دووانە جیاوازن سیفەتی بیستنەکە جیاوازە ، واتە : کاتێک بەبێ ئیضافەکردن بەبێ تقیدکردن بەکارت هێنا سیفەتەکە ئیحتیمال هەڵدەگرێت ، واتە بۆ نمونە دەڵێیت ( دەستی ئینسانێک ) لەگەڵ ( دەستی ئاژەڵێک ) هەردووکیان ناوی ( دەستە ) ئەگەر پێش ئەوەیی بڵێیت ( دەستی ئینسان یان دەستی ئاژەڵ ) تەنها بڵێیت ( دەست ) ئەوکاتە دەکرێت واتای

مەبەستی ( دەستی ئینسان ) بێت یان مەبەستی ( دەستی ئاژەڵ ) بێت ، ئەوکاتە جیاکراوە نییە و جیا ناکرێتەوە ، بەڵام کە ناوەکەی دیکەت دایە پاڵی وتت ( دەستی ئینسان ) کەواتە جیاکرایەوە دەستی ئینسان جیاوازە لە دەستی ئاژەڵ ، دەستی منداڵێک لە ڕووی قەبارەوە بۆ نمونە جیاوازە لە دەستی پیاوێکی گەورە یان ئافرەتێکی گەورە ، کەواتە سیفەتەکەیان جیاوازە ، لله المثل الأعلى، ئەم نمونانەمان بۆیە باسکرد هێنایەوە تا لە بابەتەکە تێبگەین ، کاتێک یش دەڵێین ( يَد ) دەست بەبێ هیچ ئیضافە و تەقیدێ بەکارمان هێنا ئەمە پێی دەوترێت [ إتفاق في الأسمى الكُلى المُطلَق ] واتە: ئەم دەستە لەگەڵ ئەو دەستە هیچ جیاوازیەکی نیە بۆ ؟ چونکە تۆ ئیضافەت نەداوەتە پاڵ شەخسێک ،کەسێک ، نەفسێک زاتێک تا جیاکردنەوە ڕووبدات تا جیابکرێنەوە ، بەڵام کەوتت ( يَدُ الله ) یان ( يَدُ أحمد ) ( دەستی الله سبحانە وتعالى ) یان ( دەستی ئەحمەد ) جیات کردەوە ، ڕاستە ناوەکانیان هەمان شتن بەڵام سیفەتەکەیان جیاوازە ، وەکو لە بنچینەی پێشوتردا باسمان کرد ، کاتێک کە [ ناوەکان یەکسان بوون واتایی وانیە سیفەتەکەش وەکو یەک وابێت ) کەوابوو کەوتت ( دەستی الله سبحانە وتعالى ) ڕاستەوخۆ جیادەبێتەوە لە ( دەستی ئەحمەد ) لە ( دەستی محمد ) لەخاتر ئەوەیە تۆ اضافەت کردووە بۆ لای ناوێک ، بەڵام پێش دانە پاڵەکە ئیضافەت کرد کە هەم ئیحتیمالی ئەو هەم ئیحتیمالی ئەم هەڵدەگرێت ، بە موتلەق

بەکارت هێنا ئەکاتە ( ئیتیفاقن ) هاو واتان ، بەڵام کە ئضافەت کرد ئەو هاوواتایە نامێنێت ( تەقید )ی دەکەیت ، کەوابوو پێش ئضافەکردنەکە ئیتیفاقیان هەیە ، چونکە نازانی کامیان مەبەستی ( دەستی الله سبحانه وتعالى ) یە و کامیشیان غەیری ( الله سبحانه وتعالى ) یە ، بەڵام دوای ئضافەکە بونی ( ئیتیفاق ) نامێنێت ، ئەوکاتە جیادەکرێنەوە و ( تەخصیص ) ڕوو دەدات .

## بنچینەی شەشەم :

### لا يستعمل في حق الله إلا القياس الأولى دون غيره من أنواع الأقيسة

واتە : ئەڵێین هیچ کاتێک قیاس لە حەقی الله سبحانه وتعالى دا بەکار ناهێنرێت ئیلا قیاسی [ ئەولاتر ، ئەحەق تر ، کامڵ تر ، تەواوتر ] لە حەقی الله سبحانه وتعالى بەکار دەهێنرێت .

ئێمە چەند جۆرێک قیاسمان هەیە قیاسی [ أولى ، شمولى ، تەمثیل ]ی قیاسی [ شمولی و تەمثیل ]ی لە حەقی الله سبحانه وتعالى باطلن و بە هیچ جۆرێک قەبووڵکراو نییە ، بەڵام ئەو قیاسەی کە پێی دەوترێیت [ قیاسی حەق ] لەوەی کە لە حەقی الله سبحانه وتعالى دا بەکار بهێنرێت [ قیاسی ئەولای ] ـە ، نەک قیاسی [ تەمثیل ]ی هاوشێوە بێت نەخێر ، بەڵکو [ ئەولاتر ] چونکە ئێمە وتمان ( غائب ) قیاس ناکرێتە سەر ( شاهد ) ئەوەی کە ( نادیارە ) قیاس ناکەینە سەر ئەوەی کە ( دیارە و دەیبینی ) ، بەڵام ئەم قیاسە پێی دەوترێ [ ئەولاتر ، کامڵ تر ، تەواو تر ]

بۆ نمونە / ئەڵێین ئەگەر سیفەتێک لە مەخلوق هەبێت سیفەتێک لە ئینساندا هەبێت ئەو سیفەتە سیفەتێکی کەمال بێت سیفەتێکی تەواوبێت ( الله سبحانه وتعالى ئەولاترە ئەحەق ترە ) ئەو سیفەتەیی

هەبێت ، وە هەرنەقسێک لە مەخلوقاتدا هەبێت هەر عەیبەیەکی تێدابێت ( اللە سبحانەو وتعالی ) ئەحەقترە ئەولا ترە ئەو سیفەتەی تێدا نەبێت .....

بۆ نمونە / ( مردن ) نەقسە نووقسانیە بۆ مەخلوق کەواتە ( اللە سبحانە وتعالی ) ئەولاترە ئەو سیفەتەی نەبێت ، ئینسان ناتوانێت بەسەر مردندا زاڵ بێت کەواتە نەقسی هەیە لەو سیفەتەدا کەوا ( مردن )ە بە نیسبەت ئینسانەوە چییە ؟ سیفەتێکی نەقسە هیچ کەسێک ناتوانێت دەربازی ببێت ، اللە سبحانە وتعالی ئەو سیفەتەی نیە ئەولاترە ئەو سیفەتەی نەبێت ئەحەقترە ئەو سیفەتەی نەبێت ، ئەگەر بۆ مەخلوق عەیب بێت کەواتە بەهیچ جۆرێک بۆ ( خالق بۆ اللە سبحانە وتعالی ) نابێت ئەو سیفەتە هەبێت ، چونکە اللە سبحانە وتعالی هیچ سیفەتێکی نەقسی نییە ، هەموو سیفەتەکانی اللە سبحانە وتعالی کەماڵن ، بۆنمونە [ جەهل ، نەزانی ، غەدر ، خیانەت ، لغووب ] ئەمانە سیفەتی نەقسن لە مەخلوقاتدا کەواتە ( اللە سبحانە وتعالی ) ئەحەقترە ئەو سیفەتانەیی نەبێت ، ئەگەر ئینسانێک [ جەهلی نەبێت ، غەدری نەبێت ، خیانەتی نەبێت ] کەواتە لەم سیفەتانەیا کاملّن ، کەواتە ( اللە سبحانە وتعالی ) ئەحەقترە سیفەتی کەمالی هەبێت کامل تر تەواوتر ئەولاتر لە مەخلوقات ، کە واتە اللە سبحانە وتعالی ( عَلاّم الغیوب ) زۆر زانایە ، اللە سبحانە وتعالی سیفەتی خیانەتی

نیە بۆ ؟ چونکە سیفەتی خیانەت ناتەواویە نەقسە ، ئەگەر ئینسانێک سیفەتی وەفای هەبێت کاملە ، ئینسان بە نیسبەت ئەو سیفەتەوە کاملە تێدا ( الله سبحانە وتعالی ) ئەولاترە ئەو سیفەتە کەمالەی هەبێت ، ڕاستە دەڵێیین لە ناودا وەکو یەک وان بەڵام کەمالیەتی الله سبحانە وتعالی زۆر جیاوازە لە سیفەتی کەمالیەتی مەخلوقات ، الله سبحانە وتعالی وەفای هەیە بەرامبەر بەندەکانی خیانەتیان لێناکات ، سیفەتی ژیان حەیات کەمالە بۆ مەخلوق کەواتە الله سبحانە وتعالی ئەولاترە ئەو سیفەتەی هەبێت ، { الله لَآإِلَهَ إِلَّاهُوَ ٱلحَىُّ ٱلقَيُّومُ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَومٌ } سیفەتی عیلم سیفەتی بیستن سیفەتی بینین ئەمانە کۆمەڵێک سیفاتن ئەگەر لە ئینساندا هەبێت سیفەتێکی چین ؟ کەمالن سیفەتی باشن نیشانەی کامڵ بوونی ئەو ئینسانەیە ، کەواتە الله سبحانە وتعالی ئەولاترە ئەحەقترە ئەو سیفەتانەی هەبێت ، سیفەتی [ جەهل و نەزانی و خیانەت ] عیبەیە بۆ مەخلوق کەواتە الله سبحانە وتعالی ئەحەقترە لەمەخلوقات کە ئەو سیفەتانەی نەبێت ، کەوابوو لە بنچینەکە تێبگەین ( ئەوەی لە حەقی الله سبحانە و تعالی دا بەکار دەهێنرێت قیاسێکی ئەولاترە نەک قیاسێکی تەمثیلی یان شمولی ) قیاسێکی ئەولاترە لە جۆرەکانی قیاسکردن ، بەهیچ جۆرێک سیفاتی الله سبحانە وتعالی قیاس ناکرێتە سەر سیفاتی مەخلوقات ، بەڵام وەکو وتمان الله سبحانە وتعالی دەبیستێ بەڵێ ئینسانیش دەبیستێ بەڵێ هەردووکیان خاوەنی ئەو سیفەتەن بەڵێ

، بەڵام ئایە سیفەتیان وەكویەك وایە ؟ نەخێر حاشا و كلا ، بیستنی
الله سبحانه وتعالی و بینینی و دابەزینی الله سبحانه وتعالی بۆ ئاسمانی
دوونیا و بەرز بوونەوەیی قسەكردنی و تەواوی سیفەتەكانی جیاوازە
لە سیفەتی مەخلوقات ، با لە ناویشدا وەكو یەك وابن ، وە ئەگەر
سیفەتێكمان هەبێت لە ڕوویەكەوە نەقسی تێدابێت لە ڕوویەكی
كەوە كەمالی تێدابێت دیسانەوە ئەم سیفەتە بۆ الله سبحانه وتعالی
جێگیر ناكەین ، چونكە وتمان الله سبحانه وتعالی خاوەنی هیچ
سیفەتێكی عیب نییە بەهیچ جۆرێك ، بۆ نمونە / منداڵ بوون
،ئافرەتێك منداڵی دەبێت پیاوێك منداڵیان دەبێت سیفەتێكی
كەماڵە ، یانی ئەگەر كەسێك منداڵی نەبێت دوو هاوسەر منداڵیان
نەبێت سەردانی دكتۆر دەكەن و عیلاج و دەواو دەرمان ئەمانە بەكار
دێنن بۆ ؟ لەبەرئەوەی هەستەكەن عەیبەیەكیان تێدایە كە
منداڵیان نابێت ، چونكە فیترەتی ئینسان بەشێوەیەكی كامڵ ئەوەیە
كە ببنە خاوەن منداڵ لەڕووی جەستەییەوە تەواو بن ، كەواتە لەم
ڕووەوە ئەگەر منداڵیان هەبێت كامڵن وە ئەگەر نەیانبێت عەیبەیان
تێدایە ، ئەگەر منداڵیان هەبێت كامڵن بەڵام لە ڕوویەكی كەوە
نەقسی تێدایە بۆچی ؟ ئەوەیە كە پێویستیان پێیەتی ژیانی ئادەمیزاد
ئەوەیە كە پێویستی بەچییە ؟ بە وەچە خستنەوەیە پێویستی بە منداڵ
هەیە ، بۆیە الله سبحانه وتعالی پێویستی بەوەنیە خاوەنی ئەو سیفەتە
نیە { لَم يَلِد وَلَم يُولَد } تەواو ، الله سبحانه وتعالی پێویستی پێ نییە مادەم

نەقسێکی تێدایە ، بەهیچ جۆرێک الله سبحانه وتعالی خاوەنی ئەو سیفەتە نییە با لەڕوویەکی دیکەوە کاملیەتی تێدابێت تەواوەتی تێدابێت ، سیفەتی ( خەو ) خەو بۆ ئینسان ئەگەر ئینسانێک بەشێوەیەکی تەبیعی و سروشتی ڕیتمی خەوی تەوابێت بخەوێت بەشێوەیەکی ئاسایی کەواتە سیفەتێکی کاملە ئەڵێین هیچ کێشەیەکی تەندرووستی نیە لە شێوازی خەوتن نوستندا هیچ کێشەکی نیە ،کەواتە لەم سیفەتەیا کاملە ، ئەگەر نەقسێکی تێدابێت سەردانی دکتۆر دەکات بۆ ئەوەی چارەسەری بکات ، بەڵام لە ڕوویەکی دیکەوە ئەم سیفەتە نەقسێکی تێدایە ئەوەیە کە پێویستی پێیەتی پێویستی بەو سیفەتەیە ، بەڵام الله سبحانه وتعالی پێویستی پێ نیە ، کەواتە ئەم سیفەتە مادەم ئینسان پێویستی پێیەتی کەواتە لەو ڕووەوە نەقسە چونکە پێویستی پێیەتی موحتاجیەتی ، بەڵام الله سبحانه وتعالی پێویستی بە خەو هەیە ؟ نەخێر { لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوم }

کەواتە خەوتن یان سیفەتی منداڵ بوون سیفەتێکی ئەولانین ،کەمالێتی ئێمە وتمان ئەوەی کە بەکار دەهێنرێت بۆ الله سبحانه وتعالی [ ئەولاترە ] نەک وەکو مەخلوقات کاملْ بەڵکو [ ئەولاتر لە مەخلوقات ، کاملْ تر لە مەخلوقات ، ئەحەقتر لە مەخلوقات ] .........

## بنچینەی حەوتەم :

نصوص الصفات محكمة بإعتبار معانيها متشابهة بإعتبار كيفيتها

واتە : ئەڵێین ئەو نسوسانەی ئەو ئایەت و ئەحادیثانەی کە هاتوون دەربارەی سیفاتی اللە سبحانە وتعالى دەربارەی [ أسماء و صيفاتی ] اللە سبحانە وتعالى لە ڕووی [ واتاوە ] ڕوونن و موحکەمن جێگیرن ئاشکران ، هەمووکەس مەفهوم و واتاکەی تێ دەگات ، بەڵام لە ڕووی کەیفیەتیەکەوە [ متشابەن ] واتە نادیارن غموض یان تێدایە ڕوون نین کەیفیەتیەکەیان ڕوونیە ، وەکو عولەما دەڵێن چی ؟ [ واتاکەی ] زانراوە و [ کەیفیەتیەکە ]ی نەزانراوە ، قورئان بە زمانی عەرەبی دابەزیووە واتاکانی ڕوونن بۆ کەسێک کە لە عەرەبی تێبگات ، کاتێک اللە سبحانە وتعالى باسی سیفەتێک دەکات لە قورئاندا ئەو کەسەیی کە عەرەبی تێدەگات واتایی ئەوەتێدەگات کە اللە سبحانە وتعالى باسیکردووە بۆ ؟ لەبەر ئەوەی اللە تعالى بەزمانی عەرەبی دایبەزاندوە بەزمانێک کە ئادەمیزاد قسەیی پێ دەکات ، شتێکی دانەبەزاندووە لێی تێنەگات بۆ مەبەستێکی تر نیەناوە واتە لەفزێک وشەیەکی هێنابێت بەڵام مەبەستێکی کەیی هەبێت نەخێر ، باسی شتێکی بۆ نەکردووی مەبەستی شتێکی تربێت ، کاتێک اللە سبحانە وتعالى دەفەرموێت { وَجهی }ی هەیە ڕووخساری هەیە

هەمووکەس تێدەگات کە ڕووخسار یانی چی ، وە الله سبحانه وتعالى ( چاوی ) هەیە وەکو لە وانەی ڕابردوو باسمانکرد ، ( دەستی هەیە ، پەنجەی هەیە ) هەموو کەس تێدەگات دەست یانی چی ، پەنجە یانی چی ، کەوابوو موحکەمە ڕوونە ، بەڵام ئایا کەیفیەتیەکەی دەزانین ؟ نەخێر ، ڕوونیە کەیفیەتیەکەی ، کەوابوو لەم بنچینەیا چی تێدەگەین دەڵێین [ هەموو ئەوەی کە هاتووە دەربارەی نسوسی سیفات ، سیفاتی الله سبحانه وتعالى دەڵێین واتاکەی ڕوونە زاهیردیارە مەبەست چییە ، بەڵام شێوازەکەی کەیفیەتیەکەی ئێمە نایزانین چۆنە ، ڕەنگە پرسیارێک بکرێت ، چۆن دەکرێت واتایی شتێک بزانین بەڵام چۆنیەتیەکەیی نەزانین ؟ ئەڵێین : بۆ نمونە کەسێک سەیارەیەکی کڕیووە بە کەسێکی کە دەڵێت : سەیارەیەکی کڕیووە کەسی بەرامبەر تێدەگات سەیارە یانی چی چیە و چۆنە و بەچی دەوترێت : سەیارە کەواتە واتاکەی ڕوونە بەڵام ئایا ئەوکەسە تێدەگات سەیارەکەی چ ڕەنگێکە سیفەتی چۆنە بەرزیەکەی نزمییەکەی پانیەکەی ؟ نەخێر ، تەنها دەزانێت سەیارەیەکی کڕیوە ، کەواتە واتاکەیی ڕوونە سەیارە یانی چی بەڵام شێوازەکەیی نازانێ ، یانی دەڵێین خانویەکی کڕیووە ئایا بەرامبەر وا تێدەگات کە مەبەستی گوێ درێژێک بێت ؟ مەبەستی سەیارە بێت ؟ مەبەستی ماتۆڕێک بێت ؟ پاسکیل بێت ؟ نەخێر ، کە وتت خانویەکم کڕیووە تێ دەگات خانوو یانی چی ، بەڵام ئایا سیفەتی ئەم خانووە دەزانێت خۆ نەی بینیوە

ئایا دوو قاتە،  ئایا ڕووبەڕەکەی چەندە ، ئایا ڕووە و قیبلەیە یان ڕووە و قیبلە نیە ، چەند ژووری هەیە ، نایزانین ، بەڵام تێدەگات خانووە یانی چی ، کەواتە ولله مثلُ الاعلی ، کاتێک باسی سیفەتی الله سبحانه وتعالی ـمان بۆ دەکرێت واتاکەی ڕوونە بەڵام کەیفیەتیەکەی ناڕوونە ونایزانین ، [ مُمَثِلە ] تائیفەیەکن کە لایان داوە لە حەق لە ئەهلی سونە و جەماعە ، دەڵێین چی ؟ دەڵێن : [ ئێمە نسوسەکانی سیفات هەم ماناکەی و هەم کەیفیەتیەکەشی دەزانین ] کەواتە لە چیا تێکەوتوون ؟ لە چیا پێکاویانە ؟ [ لەوا تێکەوتوون کە دەڵێن ئێمە کەیفیەتی و چۆنایەتیەکەی دەزانین ، بەڵام لەوا پێکاویانە کە دەڵێن ماناکەی دەزانین] ، ( مُفَوض )ـەکان پێچەوانەی ( مُمَثِل )ـەکان دەڵێن : [ نە مانا دەزانین نە کەیفیەتەکە ] لەوا تێکەوتون کە دەڵێن [ مانا نازانین بەڵام لەوەدا پێکاویانە کە دەڵێن کەیفیەتیەکەی نازانین ] ، حەق وابوو بڵێن ماناکەی دەزانین بەڵام دەڵێن ماناکەی نازانین بەڵام وتویانە کەیفیەتیەکەی نازانین ،ئەهلی سونەش دەڵێن کەیفیەتیەکەی نازانین ، کەوابوو ئێمە لەو نێوەندەیا چی دەردەگرین [ ئەو حەقەی کەلای ئەوانە تێکەڵ بەو باطلە کە کردوویانە وە ئەم حەقەی لای ئەمانە تێکەڵ بەو باطلە کە کردوویانە هەردوو حەقەکە وەردەگرین ] دەڵێین چی ؟ [ ئێمە واتاکەی دەزانین بەڵام کەیفیەتی و سیفەتەکەی چۆنایەتیەکەی نازانین ].......

## بنچینەی هەشتەم :

الأصل في النصوص أسماء وصفات بقائها على ظاهرها

واتە : ئەڵێین مانەوەی ئەو نسوسانەیی کەدێن دەربارەی ئەسماء و سیفاتی الله سبحانه وتعالى مانەوەیان لەسەر زاهیری خۆیی .

واتە بەبێ ئەوەی [ تەئویل یکەیت ، تەحریف یکەیت ، تەفویض یکەیت ] گۆڕانکاری تێدابکەیت وە لێکی بدەیتەوە ، وە لێکدانەوەیەکی دیکە پێچەوانەیی واتا زاهیرەکەی کە هاتووە ، بەڵکو ئەوەیی لەسەرمانە وەرگرتنیەتی لەسەر شێوەیی زاهیری خۆی ، کاتێک کە الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت { بَل یَداهُ مَبسُطتان} { خَلَقتُ بِیَدَی } واتایی ( یَد ) بریتیە لە ( دەست ) واتایەکی ڕوونە وا لێکی نادەینەوە بڵێن دەست لێرە واتایی ( قووەتە و هێزە و نعمەتە ) نەخێر ، بە واتای دەست دێت واتا زاهیرەکەیی وەردەگرین بەبێ ئەوەی [ تەئویل یکەین ، یان بیگۆڕین بۆ واتایەکی کە ] کاتێک دەڵێین الله سبحانه وتعالى { اسْتَوَىٰ على العَرش } { ثم استوىٰ إلى السماء } ئەم واتایانە ڕوونن ( یَد ) ( دەست ) واتای ڕوونە ، ( وَجه ) ( ڕوخسار ) واتای ڕوونە (اسْتَوَىٰ )( بەرزبوونەوە ) واتای ڕوونە ، کەسێک کە لە زمانی عەرەبی تێبگات و تێگەیشتبێت لەو سەردەمەی کە وەحی هاتووە الله

تعالى جل جلاله ئەم ئایەتانەیی کە دابەزاندوە باسکردنی لەم سیفەتانەیی خۆی واتاکەی ڕوون بووە تێگەیشتون واتاکەی واتایی چییە ( اسْتَوَىٰ) واتای ( بەرزبوونە) وە ،( صعَدَ - یَرتَفَعَ ) (وَجہ ) واتە : ( ڕووخسار ) ،( یَد ) واتە : ( دەست ) ، ئیدی نایەین ئەم واتایانە بە واتایەکی کە بگۆڕین ، کەوایە چی دەکەین ؟ زەهیری نەسەکە کەهاتووە دەربارەی ئەسماء وسیفات زاهیرەکەی وەردەگرین ، ئیلا مەگەر ئەوەیی نەصێک هاتبێت واتە قەرینەیەک هەبێ کە لابدات لە حەقیقەت ، واتە بە دەلیل کە نەبوو زاهیری نسوسەکە وەردەگرین .

( وەلیدی کوڕی موسلم ) رحمهم الله تعالى دەفەرموێت : پرسیارم لە ( ئەوزاعی و مالیکی کوڕی ئەنەس و سوفیانی ثەوری کرد وەیسی کوڕی سەعدیش ) رحمهم الله تعالى دەربارەی ئەم ئەخبارانەیی کە هاتوون دەربارەی ئەسماء و سیفات هەرهەموویان فەرموویانە : ( أُمِرها کَما جائت ) بەو شێوەیەیی کە هاتووە با وابڕوات ، چۆن هاتووە بەو شێوەیە وەریبگرە زاهیرەکەی وەرەگرین ، ( جەعفەری کوڕی عبدالله ) رحمه الله دەفەرمووێت : [ پیاوێک هات بۆ لای مالیکی کوڕی ئەنەس رحمه الله دەربارەیی ئەو ئایەتە پرسیاری لێکرد { الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ ﴿٥﴾[طه] } الرحمن لەسەر عەرش چی بووە ؟ ( اسْتَوَىٰ )یکردوە بەرزبووەتەوە و جێگیربووە بۆسەر عەرش ، ئیمامی مالیک

رحمه‌الله نه‌ی فه‌رموو ئه‌م ( اسْتَوَىٰ ) چۆنی لێ تێده‌گه‌ی وا لێکی بده‌وه ، ئه‌م ( اسْتَوَىٰ ) واتای ئه‌وه‌ی هه‌یه واتایه‌کی دیکه‌ی هه‌یه ، نه‌خێر ، به‌ڵکو فه‌رمووی ( الكيفُ غَيرُ مَعقول ) واته که‌یفیه‌تیه‌که‌ی مه‌عقول نیه ، نایزانین که‌یفیه‌تیه‌که‌ی ، له بنچینه‌ی پێشوتردا خوێندمان که وتمان نسوسه‌کانی ئه‌سماء و سیفات ( مُتَشابِهة بإعتبار كَيفيتها ) واته : ڕوون نین که‌یفیه‌تیه‌کانیان بۆ ئێمه نادیاره ، که‌واته ئیمام فه‌رمووی ( الكَيفُ غَيرُ معقول ). ( والإستواء غَير مَجهُول ) ، (اسْتَوَىٰ)ـش شتێک نیه که عه‌ره‌ب تێنه‌گا واتای چییه ، عه‌ره‌ب تێده‌گات کوتت ( اسْتَوَىٰ ) یان چی ، له سه‌رده‌می دابه‌زینی وه‌حیدا قوره‌یش أصحاب و هاوه‌ڵان و موشریکین هه‌موویان تێگه‌یشتبوون له وشه‌ی (اسْتَوَىٰ ) بۆچی ؟ چونکه قورئان به‌چی دابه‌زیوه ؟ ( بِلِسانٍ عَرَبِي مُبِين ) به‌زمانی عه‌ره‌بی دابه‌زیووه ، بۆیه ئیمام فه‌رمووی ( اسْتَوَىٰ ) که که‌هاتووه که پرسیارده‌که‌یت شتێک نیه نه‌یزانێ یانی چی واتاکه‌ی ڕوونه ( والإيمان بهِ واجبُ ) ئیمان بوون پێشی چییه؟ واجبه ( والسؤال عنهُ بِدعَه ) پرسیارکردن ده‌رباره‌ی بیدعه‌یه .

چیت داوه له‌وه بۆ پرسیاری لێده‌که‌یت له شتێک که ڕوونه . ( وَإِنِ أخاف أن تكون ظالّا ) ئیمام فه‌رمووی : ( من وای ده‌بینم ده‌ترسم که تۆ چیبیت گومڕابیت ) فه‌رمانیکرد ده‌ریانکرد له‌و مه‌جلیسه‌یا . ئیمامی وه‌کیع ده‌فه‌رمووێت : [ نُسَلِمُ هذا الأحاديث كَيفَ هذا ] واته [ ناڵێین

چۆنه ئه‌مه ، چۆن وایه ] [ وَلِمَ جاءَ هذا ] واته [ وه بۆچی به‌م جۆره هاتووه] نه‌خێر ، ئێمه ئیشمان ئه‌وه‌نییه ، ئیشمان چییه ؟ ته‌سلیم بوونیه‌تی ته‌سلیم بوونی نه‌سه‌كانه .

یه‌حیایی كوڕی مه‌عین ده‌فه‌رمووێت : [ شاهیدبووم لای زه‌كه‌ریایی كوڕی عه‌دی كه پرسیاری له وه‌كیعی كوڕی جه‌ڕاح كرد وتی : ئه‌ی باوكی سوفیان ئه‌و ئه‌حادیسانه‌ی كه هاتوون بۆنمونه ده‌رباره‌ی ئه‌وه‌ی كه ده‌وترێ ( كورسی جێی هه‌ردوو پێی موباره‌كی الله سبحانه وتعالى یه ) ؟

وكیع ده لیت : [ ئێمه گه‌یشتین به إسماعیل به سوفیان به میصعار ئه‌م كۆمه‌ڵه زانایانه هه‌موویان ئه‌م ئه‌حادیسانه‌یان باسده‌كرد به‌بێ ئه‌وه‌ی ته‌فسیریكه‌ن باسی چۆنیه‌تی و كه‌یفیه‌تیه‌كه‌یان نه‌ده‌كرد ] ، به‌ڵكو ته‌سلیمی چی ده‌بوون زاهیره‌كه‌ی ده‌بوون ، كه‌واته مانه‌وه‌ی نه‌سه‌كان ده‌رباره‌ی ئه‌سماء وسیفات له‌سه‌ر زاهیریه‌ت ، سوفیانی كوڕی عوینه ده‌فه‌رمووێت :[ كُلُ شيئ وَصَفَ اللهُ بهِ نَفسَهُ فى ألقُرآن فَقِراءته تَفسِرُهُ لا كَيف ولا مِثل ] ، ئیمامی داره‌قوطنی له سیفاتا هێناویه‌تی [ هه‌مووشتێك كه الله سبحانه وتعالى وه‌سفی خۆی پێكردووه له قورئاندا خوێندنه‌وه‌كه‌ی ته‌فسیریه‌تی ، ئیدی ناچیت ته‌فسیرێكی كه بهێنی هه‌ڵیبگرێت بڵێیت ( ده‌ست ) به‌واتای قووه‌ت دێت!! نه‌خێر ، تۆ خوێندوته‌ته‌وه ( یَد ) ( وَجه ) ته‌واو واتاكه‌ی ڕونه و بریتیه له ته‌فسیره‌كه‌یی خوێندنه‌وه‌كه‌ی ، ناڵێ چۆن و له‌به‌رچی وایه .

حومەیدی لە أصول السنة یا دەڵێیت : [ أصولهُ السُنة عِندَنا فَذَكَرَ أشياء ] كۆمەڵێك شتی باسكرد فەرمووی [ ئێمە بنچینەكانی سونە لای ئێمە بریتییە لە كۆمەڵێك شت ] لەوانە [ وَما نَطق بهِ القرآن والحديثُ مِثل ] { وَقالَتِ اليَهودُ يَدُ اللهِ مَغلُولة غُلَت أيدِيهم } واتە : [ هەمووی كە قورئان و حەدیث باسیانكردووە بۆنمونە كە یەهود وتیان دەستی الله وتعالی چییە ؟ كۆتكراوە بەغیل و چرووكە ] والعياذ بالله ، باسی چیانكرد ؟ دەستی الله سبحانه وتعالی ، یان ئەوەی كە الله سبحانه وتعالی دەفەرموێت : { والسماوات مطويات بيمينه } [ وَما أشبَه مِنَ القرآن والحديث ] هەموو ئەوانەی كە هاتوون دەربارەی سیفەتەكانی الله سبحانه وتعالی لەم دوو ئایەتەدا باسی جێگیركردنی سیفەتی ( دەست دەكات بۆ الله سبحانه وتعالی )

حومەیدی دەڵێت :[ لانُزيدَ فيهِ وَلا نُفَسيرُهُ ] واتە :[ شتێكی لێ زیاد ناكەین وە تەفسیری ناكەین ] تەفسیری ناكەین یانی چی ؟ واتە زاهیرەكەيی وەردەگرین پێویست بەوەناكات تەفسیری بكەین، چونكە واتاكەی ڕوونە و زاهیرەكەی وەردەگرین و تەسلیمی دەبین.

[ وَنَقِفُ على ما وَقَفَ عليهِ القرآن و السنة ] واتە : [ **ئەوەستین لەو شوێنەی قورئان و سونەت وەستاون** ]

[ الرَحمنُ على العَرشِ استوى ] [ الله سبحانه وتعالى بەرزبووەتەوە بۆ سەر عەرش لەسەر عەرش جێگیربووە یان دانیشتووە وەکو ئەو ئەثەرانەی کە هاتووە ].

[ وَمَن زعم غَيرَ هذا ] واتە : [ هەر کەسێک پێچەوانەی ئەمە بڵێیت یان مەبەستی ئەوە بێت ئەم ئایەتانە ئەم ئەحادیثانە تەفسیر بکات لێکی بداتەوە واتاکەی بگۆڕێت لە زاهیرەکە لابدات، [ فَهُوَ مُبطِلُ جَهمى ] واتە ئەو کەسە چیە ؟ [نەسەکانی قورئان و سونەتی إیطال کردۆتەوە وە کەسێکی جەهمیە پەنا بە الله سبحانه وتعالى ] .

## بنچینەی نۆیەم :

### لا يتعارض نص صحيح مع عقل صريح

واتە : ئەڵێین هیچ نەصێكی صەحیح ، ( صەحیح ) مەبەستمان ئەوەیە كە لە سونەت هاتبێت و بە صەحیحی هاتبێت واتە لە قورئان و لە سونەت هیچ نەصێك نیە كە پێچەوانە و موتەعارضی بێت لەگەڵ عاقڵێكی صەریحا ، عەقڵی صەریح واتە [ سَلِيمُ من الأفات ] واتە : [ پارێزرا و تەندروست بێت لە ئافات لە شوبوهات لە شیرك لە عەقڵییەتی موشەبیهە لە عەقڵیەتی موفەویزە لە عەقیدەیی جەهمی لە ئەشاعیرە لە موعتەزیلە ] پارێزراوبێت لە هەموو ئەم بیر و بۆچونانە واتە عەقڵێكی صەرح بێت سەلیم بێت فیترەتی پاك بێت و نەشێوابێت بەهیچ جۆرێك تێك ناگیرێت لەگەڵ نەصی صەحیحا ، چونكە هیچ كاتێك عەقڵێك ئەگەر سەلیم بێت لەگەڵ نصوصی قورئان و سونەت تێگیران ڕوونادات هەركات تێگیران ڕویدا قەناعەتی نەكرد بەنەصێك قەبووڵی نەكرد ئەوا خەلەل لەو عەقڵەدا هەیە نەك خەلەل لە نەصەكەدا هەبێت بۆ ؟ چونكە ئەو زاتەی كە الله سبحانه وتعالى یە قورئانی دابەزاندووە ئەو نەصەی دابەزاندووە هەر ئەوە عەقڵیشی دروستكردووە الله سبحانه وتعالى عەقڵێكی دروست نەكردووە پێچەوانەی ئەو نەصە بێت كە بۆی ناردووە بەهیچ جۆرێك بۆیە هەركاتێك عەقڵت تێگیرا لەگەڵ نەصێكدا و قەبووڵی

نەکردوو قەناعەتی پێنەکرد دڵنیابە و بزانە خەلەل لە عەقڵی تۆدا هەیە نەک لە نەصەکەدا لەبەرئەوەی نەصەکان ڕوونن ، الله سبحانه وتعالی بەشێوەیەک عەقڵی درووستکردووە وە نەص یشی دابەزاندوە کە ئەو عەقڵە نەصەکە قەبوڵ بکات نەک ڕەدی بداتەوە .

## بنچینەی دەیەم :

النقول تأتي بمحارات العقول لا بمعارضاتها

واتە : ئەڵێین ئەو نەصانەیی کە هاتوون دەربارەی أسماء و سیفات برێک جار فراوان بوون لە عەقڵدا دروست دەکات تەعەجووب ڕوودەدات ، بەڵام ڕەتکردنەوە و ململانێ و دووبەرەکی لەگەڵ نەصەکەیا ڕوونادات واتە بۆنمونە ئەڵێین الله سبحانه وتعالی دادابەزێت لە کۆتایی سێ یەکی شەو هەموو شەوێک الله سبحانه وتعالی دادەبەزێتە ئاسمانی دوونیا هەموو پارچەیەکی ئەرز الله سبحانه وتعالی دابەزیووەتە ئاسمانەکەی ئاسمانی دوونیا ، لێرە فراوان بوونێک لە مێشک ڕوودەدات نەک بەو واتایەیی قەبووڵت نەبێت نا ، قەبووڵتە قەناعەتیشت پێیەتی ، بەڵام فراوان بوون لە مێشکدا ڕووی داوە لە عەقڵدا و لە فیکردا ڕووی داوە و قەبوڵیشتە بەڵام چییە ؟ توشی تەعەجووب بوویت لەگەورەیی زاتی الله سبحانه وتعالی وە دابەزینی بۆ ئاسمانی دوونیا بۆ نمونە ئینسان لە دوونیادا شتێک دەبینێت بەچاوی خۆی قەناعەتی پێیەتی چونکە بینیویەتی ، بەڵام توشی سەرسوڕمان و تەعەجووب دەبێت لەو حاڵەت و باروو دۆخەی کە بینیویەتی و کە ڕوویداوە ، [ لله المَثَلُ الأعلى ] کاتێک باسی سیفەتێکی الله سبحانه وتعالی دەکرێت هەندێک جار واسیع بوون و فراوان بوون لە مێشکتا و لە بیر کردنەوەتدا ڕوودەدات دەربارەیی ئەم سیفەتە ، بەڵام بەو واتا

نا كە قەبووڵی نەكا یان بەرامبەری بووەستێتەوە نەخێر قەبووڵی دەكات بەڵام توشی تەعەجووب و سەرسوڕمانی كردووی لەبەرچی ؟ بۆ ئەوەی وتمان عەقڵ پەیی بە هەموو شتێك نابات سنورێكی هەیە و مەحدودە دیاری كراوە لەو سنورەیی خۆی ناتوانێت بترازێت ئەگەر ویستی ترازانی هەبوو بێگومان خاوەنەكەی توشی هەڵدێران دەكات .

## بنچینەی یازدەیەم :

### أخبار الآحاد حجة في باب الأسماء و الصفات

واتە : ئەڵێین لە هەموو ئعتیقادو بیروباوەڕدا لە دیندا بە موطلەقی حەدیثی ( ئاحاد ) حوجە و بەڵگەیە ئەگەر بەشێوەیەکی صەحیح گەیشتبێت ، تەبعەن ئەمە شتێکە بەداخەوە موتەئەخیرین دایان هێناوە والله أعلم ئەنا لە سەلەفدا شتی وانەبووە حەدیث یان صەحیح بووە یان ظەعیف بووە یان کاری پێکراوە یان پێی نەکراوە .

( ئاحاد ) ئەوەی کە تەفسیریانکردووە بۆ نمونە کۆمەڵێکی کەم ئەم حەدیثەیان گێڕابێتەوە دوو ئەتباعی تابعین حەدیث ێکیان گێڕابێتەوە لە دوو تابعینەوە ئەم دوو تابعینە لە دوو صحابەوە گێڕابێتیانەوە بەڵام ( موتەواتر ) کە پێچەوانەی ( ئاحاد )ە بۆ نمونە ١٥ - ٢٠ ئەتباعی تابعین لە ١٥ - ٢٠ تابعینەوە ئەوانیش لە ١٥ - ٢٠ صحابەوە حەدیث ێکیان گێڕابێتەوە بۆتە ( موتەواتر ) واتە لە تاکایەتی و لە کەمیەتی دەرچووە کۆمەڵێکی زۆر گێڕاویانەتەوە پشتی پێ دەبەسترێت ، بەڵام هاتوون دەڵێن چی (خەبەری ئاحاد ) واتە ئەوەی کۆمەڵە کسێکی کەم ئەم حەدیثەیان گێڕابێتەوە ئێمە کاری پێناکەین لە ( أسماء و صیفات )دا نەخێر ئێمە دەڵێین ئەگەر یەک حەدیث یشبێت یەک ئەتباعی تابعین گێڕابێتیەوە لە یەک تابعینەوە لە یەک صەحابەوە مادەم بە صەحیحی گەیشتبێت بە ئێمە قەبووڵی

دەکەین و ئیعتیقاد و بیروباوەڕمانی لەسەر دادەمەزرێنین و وە دینە بۆ ئێمە ، بۆنمونە [ حەدیثی پێکەنینی الله سبحانه وتعالی ] کە دێینە سەری لە شوێنی خۆیدا ، یان سیفەتی [ پەنجە ] بۆ الله سبحانه وتعالی دەوترێت حەدیث ێکی ( ئاحاد ) قەناعەتمان پێی نییە ، یان سیفەتی [ پێ ] ئێمە دەڵێین مادەم بەشێوەیەکی صەحیح و دروست گەیشتووە بە ئێمە ، حەدیثەکە صەحیحە بە هیچ جۆرێک ڕەتی ناکەینەوە و قەناعەتمان پێیەتی و عەقیدەمانی لەسەر بینا دەکەین ئیتر ( ئاحاد ) بێت یان ( موتەواتر ) بێت .

## بنچینەی دوازدەیەم :

باب الصفات خبري محض وخبري وللعقل فيه مجال

واته : ئەڵێین بابی [ أسماء وصيفات ]ی الله سبحانه وتعالى بابێکی تەوقیفین واته : وەستاوه لەسەر نصوصی قورئان و سونەت ناتوانی لە خۆتەوه بڵێیت الله سبحانه وتعالى ئەم سیفەتەی هەیە الله سبحانه وتعالى ئەم سیفەتەي نییه ، نەخێر ، بەڵکو پێویستت بە دەلیل هەیە ، جالە بابی سیفاتدا [ خَبَرُهُ مَحض ] هەندێک سیفات هەیە خاص پێویستت بە نەص هەیە ناتوانیت بە بێ نەص قسە بکەیت بۆ نمونە الله سبحانه وتعالى دەستی هەیە ؟ الله سبحانه وتعالى پەنجەی هەیە ؟ بەڵێ ، بە عەقڵ ئینسان درک بەمە ناکات ، عەقڵ مەجالی بۆ نییە ئەگەر نەص نەبێت ، ئەگەر نەص نەبوو عەقڵ مەجالی بۆ نییە ، بەڵام ئەگەر هەبوو ئەو کاتە ئەگەر عەقڵ سەلیم بوو شوێنی نەصەکە دەکەوێت و قەناعەتی پێیەتی ، [ پێ ] پێی الله سبحانه وتعالى پێویستت بە چی هەیە ؟ پێویستت بە نەص هەیە بە بێ نەص ناتوانی قسەی تێدا بکەیت ، بەڵام کۆمەڵێک سیفاتمان هەیە وەکو ئەوەی الله سبحانه وتعالى سیفەتی [ حَیاة- ژیان ]ی هەیە سیفەتی [ علو ]ی هەیە سیفەتی [ علم ]ی هەیە ، ئەمانە کۆمەڵە سیفاتن یان سیفەتی ئەوەیی کە الله وتعالى خالقە دروستکارە ، ئەمانە کۆمەڵە سیفاتێکن کە ئەگەر نەقڵیش نەبێت عەقڵ مەجالی بۆ هەیە عەقڵ پەی پێدەبات ، بۆیە

کەسێک کە بڕوایی بە وجودیەتی اللە سبحانە وتعالی نەبێت عیبادەتی غەیر اللە سبحانە وتعالی دەکا و موشریک بێت یان بۆ نمونە یان بڕوای بەوە نەبێت کە اللە تعالی [ خالقە ] یان بڕوایی بەوەنەبێت کە [ علم ]ی هەیە یان بڕوایی بەوەنەبێت کە اللە سبحانە وتعالی [ حَیات -ژیان ] نی هەیە ، { اللهُ لَآ إِلهَ إِلَّاهُوَ الحَیُ القُیَّومُ } ئەگەر نەصی قورئان و سونەتیشی پێ نەگات هیچ حوجە و بەڵگەیەکی بۆ نییە لە قیامەتدا بڵێ بەڵگەم پێ نەگەیشتووە ، چونکە فیترەتی ئەم کەسە شێواوە ئەگینا اللە سبحانە وتعالی بە شێوەیەک ئەو عەقڵەیی دروستکردووە کە پەیی بەو شتانەببان ، بۆیە کەسێک بڕوایی بەم سیفەتانە نییە بە هیچ جۆرێک کەسێک نیە کە بڕوایی بە بونی اللە سبحانە وتعالی هەبێت ، چ جای بگاتە کەسێک کە نەصی قورئان و سونەتی لابێ و بڕواشی پێینەبێت ، کە وابوو دەڵێین لە بنچینەکەدا ( کۆمەڵێک سیفات هەیە لابوود تۆ پێویستت بە نەصی قورئان و سونەت هەیە ناتوانی لە خۆتەوە بڵێی اللە سبحانە وتعالی [ پەنجە ی هەیە ، پێی ی هەیە ، چاوی هەیە ] نەخێر پێویستت بە چییە ؟ پێویستت بە بەڵگەیە چونکە ئەم شتانە شتانێک نین عەقڵی ئینسان درکی پێبکات ، ئیلا ئەوەیی کە عەقڵ شوێنکەوتەیی نەصەکە بێت ، نەصەکە دێت عەقڵت شوێنی دەکەوێت و قەناعەتی پێییەتی ، بەڵام کۆمەڵێکی دیکە لە سیفات وەکو وتمان پێویستی ئەگەر ئەگەر نەص یش نەبوو عەقڵ خۆیی درک بەو سیفەتانە دەکات ، هەر لە

ئادەمەوە علیه سلام تاکو کۆتا ئینسان لەسەر زوویدا دەمرێت ئەگەر وەحی پێنەگەیشتبێت دەلیلی ئاسمانی بۆ نەهاتبێت نەگەیشتبێت بە پێغەمبەرێک علیهم الصلاة والسلام بە بەرنامە و پرۆگرامێکی ئاسمانی کە الله سبحانه وتعالی دایبەزاند بێت نەگەیشتووە پێی قەناعەتی بەوە نەبێت [ خالقێک ] هەیە ئاسمانەکان و زەوی درووستکردوووە قەناعەتی بەوە نەبێت کە الله تعالی بوونی هەیە بە کافری مردووە و هیچ بەڵگەیەکیشی بۆ نییە لە قیامەتدا ، چونکە ئەمانە شتانێکن کە ئینسان درکی پێ دەکات وە ماڵە بەسەریەوە لە قیامەتدا ، الله سبحانه وتعالی بۆ هەموو ئومەتێک پێغەمبەرێکی ناردووە علیهم الصلاة والسلام بۆئەوەی پێیان بڵێت کە الله سبحانه وتعالی بوونی هەیە ؟ نەخێر ، { وَلَقَد بَعَثنا فِى كُلِ أُمَة رَسولَا أَنِ عبُدُوا ٱللهَ وَجتَنِبُوا ألطَّاغُوتَ } عیبادەت بکەن و فێری بەندایەتی و عیبادەتیان بکەن { ولَا تُشرِكُوا بهِ شَيئا} هاوبەش بۆ الله سبحانه وتعالی بڕیار مەدەن ، الله سبحانه وتعالی پێغەمبەرانی ناردووە علیهم الصلاة والسلام بۆ ئەوەی خەڵکی لە بەندایەتی خەڵکییەوە وە لە بەندایەتی بت وسەنەم و بەندایەتی خۆر و مانگ و ئەستێرە و ئاژەڵ و بەردوو دارەوە بانگ بکەن بۆ بەندایەتی و عیبادەتکردنی ( الله سبحانه وتعالی ) بەتاک و تەنها ، وازهێنان لە هاوبەش دانان بۆ الله سبحانه وتعالی ، لەبەر ئەوەی وجوودیەتی الله سبحانه وتعالی خالقیەتی الله سبحانه وتعالی ئینسان لابوود ئەبێت لەسەری جێگیرببێت و قەناعەتی پێی هەبێت و لەسەر ئەو

بیروباوەڕە بێت ، بۆیە بڕوا نەبوون بەم سیفەتانە بەوەیی کە وەحیت پێنەگەیشتووە لە قورئان و لەسونەت یان بە قەومانی پێشوتر نەگەیشتووە لە دەلیل لە کتابە ئاسمانیەکان کە الله سبحانه وتعالى بۆ پێغەمبەرانی ناردووە علیهم الصلاة والسلام نابێتە بەڵگە هەرگیزا و هەرگیز ، چونکە ئەمە شتانێکن پێویستیان بە بەڵگەنیە لە قورئان و لە سونەت یان لە وەحی ...

# بنچینەی سیازدەیەم :

باب الصفات أوسع من باب الأسماء وباب الأخبار أوسع من باب الصفات

هەواڵدان دەربارەی الله تعالى

لەوانەدەنگیەکەدا لەباسکردنی ئەم بنچینە کۆمەڵێک اسم و صیفەتم باسکردوە ، چەند هەڵەیەکی تێدایە لە دیاری کردنی هەندێ اسم و سیفەت وەک بابی أخبار أستغفر الله مما قلته ، بەگشتی لەو قاعیدە نارازیم بۆیە وەک ئەمانەتێک سریمەوە ، وەک راست کردنەوەیەکیش بۆ دەنگەکە، بۆیە بەم جۆرە قاعیدەکە باسدەکەینەوە

تەنها ئەم بنچینەیە تعدیلم کردوە.

تەوحیدی الأسماء و الصفات پەیوەستە بە سێ سەرچاوەوە

١-أسماء

٢-صفات

٣-هەواڵدان لە الله (الإخبار عن الله)

بابی إخبار فراوانترە لەبابی أسماء و الصفات وە تەوقیفی نین لەسەر نص بەڵکو لەسەر دروستی بەکرهێنانی وەستاوە بۆ الله

اللهلە کتابەکەیدا بۆ نەفسی خۆی کۆمەڵێ فیعلی بەکارهێناوە

وەک (الصنع) وە (الصبغة) و (الفعال) و (المريد) کۆمەڵێکی دی

(صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ) سورة النمل ٨٨.

﴿صِبْغَةَ ٱللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ﴾

[البقرة ١٣٨]

(إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ) هود١٠٧.

لەم سیفەتانە وەک المريد لە الإرادة وە متكلم لە كلام وە الشائي لە المشيئة وە الصانع لە الصنع ، جائیز نیە بۆ الله بەکار بهێنرێن نە بە اسم نە بە وەصفیش ، بەڵام جائیزە و دەکرێت وەک هەواڵدان دەربارەی الله بەکاری بهێنین ئەگەر تایبەت بێ بەو دەلالەتانەی کە مەدحی اللەی پێدەکرێت ، بەبێ ناونان و وەصف ، دەڵێیت ئەمانە لەبابی خەبەردان هەواڵ نەک ناو یان وەصف ، الله مريد للخير ، شائي البر ، متكلم بالحق.

بەڵام گەر ئەم لەفزانەت بەکارهێنا لە سیاقی مەدح و ثناء ، جائیزە هەواڵی پێبدەی لە الله و وەصفی پێبکەیت ، بۆنمونە هەواڵبدەیت و

وەصفی اللەبکەی بەوەی اللە وەصف کراوە بە ئەوەی خێر و ئاسانکاری دەوێت ، ویستی چاکەی هەیە ، بە ڕاستگۆی قسەدەکات ، وەجگە لەوانیش.

هەروەها موجود و شيء بابی أخبارن نەک ناو یان صیفەت.

ئەوەی لە سونەت هاتوە لەبابی أخبار دەربارەی اللە

أ-هەواڵدان دەربارەی اللە بەوەی (شخص)ە

بوخاری لە صەحیحەکەی بابێکی داناوە بەناوی لاشخص أغير من الله

هەروەها ابن أبی عاصم له السنه ٢/٣٦٤

ب-شيء بوخاری لە صەحیحەکەی دەربارەی ئەو ئایەتە کە اللە دەفەرموێت ( قل أي شيء أكبر الشهادة قل الله )

اللە خۆی ناوناوە بە شيء

ج-وتەی ئەهلی سونە بەوەی دەڵێن اللە لەسەر عەرشە بەزاتی خۆی

على عرشه بذاته.

د-هەواڵدان دەربارەی ئەوەی الله حەدی هەیە وە جیابوەیە لە دروست کراوەکانی.

# بنچینەی چواردەیەم :

## القول في الصفات كالقول في الذات

واتە : ئەڵێین قسەکردن لە سیفاتەکانی الله سبحانه وتعالى دا وەکو قسەکردن وایە لە زاتی الله سبحانه و تعالى دا واتە ئەوەی دەیڵێیت دەربارەی زاتی الله سبحانه و تعالى دەربارەی نەفسی الله سبحانه وتعالى دەربارەی سیفاتەکانیشی بیڵێ ، ئایا الله سبحانه وتعالى زاتە ؟ بەڵێ زاتە ، کەوایە ئەوزاتە چییە ؟ سیفەتیشی هەیە ئایا زاتی الله سبحانه وتعالى لە زاتی درووستکراوەکانی دەچێیت ؟ نەخێر ، کەوایە سیفەتی ئەو زاتی الله سبحانه وتعالى یشە لە سیفەتی درووستکراوەکانی ناچێیت وەک چۆن دەڵێین الله سبحانه وتعالى زاتە ئاوا دەڵێین سیفەتیشی هەیە ، وەک چۆن دەڵێن زاتی الله سبحانه وتعالى بەهیچ شێوەیەک لە زاتی درووستکراوەکانی ناچێیت کەواتە سیفەتی الله سبحانه وتعالى لە سیفەتی درووستکراوەکانی ناچێیت ، وەک چۆن ( لَيسَ كمثله شيئ) ( وَلَم يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحَدُ ) بەهەمان شێوە لە سیفاتەکانیشدا هەمان قسەدەکەین .

## بنچینەی پازدەیەم :

### التعبير عن المعاني الشرعية بألفاظ النصوص أولى

واتە : ئەڵێین ئەمە وەک ئەوەی بۆ نمونە کاتێک دەربارەی سیفەتێکی الله سبحانه وتعالى قسەدەکەیت باشترە ئەوانە بەکاربێنی بۆ الله سبحانه وتعالى کە خۆی بەکاری هێناوە بۆ زاتی خۆی یان رسول الله صلى عليه وسلم ، بۆ نمونە تۆ وشەیەکت هەیە دەتوانی بۆ الله سبحانه وتعالى بەکاری بهێنی لە قورئان و حەدیث نەهاتووە هیچ کێشەیەکی تێدانیە بەڵام وشەیەکی دیکەمان هەیە هەمان واتا دەگەیەنێت لە قورئان و لە سونەت بکارهاتووە باشتر و ئەولاترە ئەوە بەکاربهێنیت ، بۆ نمونە ئەڵێین { لَيسَ كَمثلِه شيئ } الله سبحانه وتعالى هاوشێوەی نییە ، ئەشتوانی بڵێیت ( لَيسَ كشبهه ) (شبه) یان ( مثل ) واتە : هاوشێوە هاو وێنە ، بەڵام مادام لەفزەکە شەرعییە کە بووترێت { لَيسَ كَمِثلِهِ } لە قورئاندا بەو شێوە بەکارهاتووە ئەولاترە ئەوە بەکاربهێنیت ، { لَا تَضرِبُ للهِ الأمثال } وە دەکرێت ئەگەر کەسێک بڵێ ( لَا تضرِبُ أشباه ) بەڵام ئەولاترە جوانترە وایە کە ئەوە بەکار بهێنی کە الله سبحانه وتعالى بەکاری هێناوە ، مەبەستمان لەفزی ئایەتەکە نییە بیگۆڕی ، بەڵام کاتێک کە بەکارت هێنا دەربارەیی الله سبحانه وتعالى وەکو قسەیەک کە بیکەی وەکو هەواڵدانێک لە الله سبحانه وتعالى نەک وەکو

خوێندنەوەی قورئان ئەوە هیچ گۆڕانکاریەک نابێت تێدا بکرێت عیاذا باللە ، بەڵام دەڵێی چی ؟ اللە سبحانە وتعالی هاوشێوەی نیە { لَیسَ کَمثِلِه شيئ } ئەگەر وشەیەکی دیکە بەکاربهێنی هەمان واتای هەبێت ئیشکالیەتێکی تیا نییە وەکو ئەوەی تۆ بتەوێ اللە سبحانە وتعالی پاک ڕابگریت لە چی لە تەمثیل و شوبهاندن لە مەخلوقات ، بەڵام باشتر و ئەولاترە ئەوە بەکاربهێنی کە لە شەرعدا بەکارهاتووە ...

## بنچینەی شازدەیەم :

### القول في الصفات كالقول في بعضها

واتە : ئەڵێین قسەكردن دەربارەی سیفاتی الله سبحانە وتعالی بەگشتی وەكو قسەكردن وایە دەربارەی هەندێكی ، یانی چی ؟ واتە ئەوەی بۆ سیفەتێك دەیڵێیت واجبە بۆ هەموو سیفەتەكانی بیڵێیت ، بۆ نمونە : ئەڵێیت الله سبحانە وتعالی [ **دەبیستێ و دەبینێ و لە ئاسمانە و لەسەر عەرشە و استوی** ] ی هەیە بۆ تەواوی سیفەتەكانی دیكەش هەمان شت ئەڵێیت ، بۆ نمونە : ئەڵێین [ بیستن ]ی الله سبحانە وتعالی وەكو [ بیستن ]ی مەخلوقات نییە ، یان ئەڵێین الله سبحانە وتعالی [ ڕووخسار ، وَجە ]ی هەیە بەڵێ ، وەك چۆن وتمان [ بیستن ]ی الله سبحانە وتعالی وەكو [ بیستن ]ی مەخلوقات نییە كەواتە ئەڵێین [ ڕووخسار ]ی الله سبحانە وتعالی وەكو [ ڕووخسار ]ی مەخلوقات نییە ، وەكو چۆن ئەڵێین[ وَجە ، ڕووخسار]ی الله تعالی وەكو [ ڕووخسار ]ی مەخلوقات نیە ئاوا ئەڵێین [ استوی ]ی الله سبحانە وتعالی وەكو [ أستواى ]ی مەخلوقات نییە ، وەكو چۆن ئەڵێین [ استوی ]ی الله سبحانە وتعالی وەكو [ أستواى ]ی مەخلوقات نیە ئاوا ئەڵێین [ دەست ]ی الله سبحانە وتعالی وەكو [ دەست ]ی مەخلوقات نیە ، واتە : ئەوەی لە سیفەتێكدا ئەڵێییت و جێگیری دەكەیت چۆن بڕوا و قەناعەتمان پێییەتی و عەقیدەمانی لەسەر دادەمەزرێنین بەهەمان شێوە لە تەواوی

سیفەتەکان واتە جێگیری دەکەین هەموو سیفەتەکان کە الله سبحانە وتعالی و رسول ـەکەی جێگیریانکردووە بۆی بەبێ ئەوەی [ بی شوبهێنیت ، تەعطیل یکەیت ، تەمثیل یکەیت ، تەشبهی یکەیت ] هەموو ئەوانەی لێ نەفی دەکەین کە الله سبحانە وتعالی و رسول ـەکەی نەفیان کردووە ، بەو شێوەیە جێگیری دەکەین کە بۆخۆی جێگیری کردووە جل جلالە ...

## بنچینەی حەڤدەیەم :

### الواجب في النصوص الصفات إثباتها مع قطع دابر المماثلة والطمع في التعرف على كيفيتها

واتە : ئەم بنچینە تاڕادەیەک لە بنچینەکانی دیکەدا خوێندومانە بە جیاواز لە چەند بنچینەیەکدا ، بەڵام لێرە وەکو ئەوەیی کە سێ شت لەم بنچینەیا هەیە واتە دەربارەی هەر نصوص ێک لە أسماء و سیفات پێویستمان بە سێ شتە کە ئەنجامی بدەین :

١- **إثبات** : ئەو سیفەتە ئەو إسمە جێگیردەکەین بۆ الله سبحانە وتعالى.

٢- **قَطعِ دابِرِ مُماثَلَة** : بەهەموو شێوەیەک شوبهاندنی ئەو سیفەتە ئەو إسمەیی الله سبحانە وتعالى بەهی مەخلوقات بەهی دروستکراوەکانی نەفی دەکەین ، واتە بەهیچ شێوەیەک نایی شوبهێنین ، جێگیری دەکەین بۆ الله سبحانە وتعالى وە نای شوبهێنین .

٣- **وَقَطعِ طَمَعَ فى التعرف على كيفيتها** : وە پرسیار کردن و لێکۆڵینەوە دەربارەی چۆنیەتی ئەو سیفەتە ناکەین .

- کەواتە لەم بنچینەیا سێ شتمان هەیە ( ١ ) سیفەتەکە جێگیر دەکەین ( ٢ ) نایی شوبهێنین بە مەخلوقات ( ٣ ) دەربارەی

چۆنیەتی و کەیفیەتیەکەیشی پرسیار ناکەین و لێی ناکۆڵینەوە .

{ وَرَحمَتی وسعت كُلَ شئ } بۆ نمونە ئەم ئایەتە ، یەکەم إثباتی سیفەتێک دەکەین بۆ الله سبحانه وتعالی کە بریتییە لە سیفەتی ( رَحمَة ) ، دووەم ناڵێین ڕەحمەتی الله سبحانه وتعالی وەکو ڕەحمەتی مەخلوقات وایە ، ئەڵێین بە هیچ جۆرێک لە ڕەحمەتی مەخلوقات ناچێت ، سێیەم پرسیار ناکەین لە کەیفیەتیەکەی ئایا ڕەحمەتی الله سبحانه وتعالی چۆنە ، نەخێر ، دەڵێین هەیە و ڕەحمەتی هەیە و دڵنیایشین لە مەخلوقات ناچێت ، بەڵام چۆنیەتیەکەی نازانین .

## بنچینەی هەژدەیەم :

الواجب في الصفات النقص نفيها عن الله و إثبات ضدها له سبحانه

واتە : ئەڵێین واجبە لە سیفاتی الله سبحانه وتعالى ئەو سیفەتانەی کە نەفین نەفی دەکەین بۆ الله سبحانه وتعالى وە پێچەوانەیی ئەو سیفەتە نەقص و ناتەواوانە جێگیرئەکەین بۆ الله سبحانه وتعالى ، واتە : واجبە لەسەرمان ئەو سیفەتانەی کە نەقص ـن ئێمە نەفی بکەین لە الله سبحانه وتعالى یا ، چونکە الله سبحانه وتعالى سیفەتەکانی [ عُليا ]ن نەقصـ ی تێدا نیە ، ئەی ئەگەر سیفەتێک هەبوو نەقصـ بوو بۆ الله سبحانه وتعالى بەکاری نایەنی ئەبەدەن ، لە بەرامبەریشدا پێچەوانەی ئەو سیفەتە کە نەقصە جێگیری دەکەین ، { وَلَا يظلم رَبُّكَ أحدا } ئەڵێین الله سبحانه وتعالى زوڵم لە هیچ کەسێک ناکات ، کەواتە نەفی سیفەتێکی کرد الله سبحانه وتعالى کە بریتیە لە چی ؟ لە ستەم زوڵم ، کەواتە ئێمە لە بەرامبەر ئەوەدا سیفەتێک بۆ الله سبحانه وتعالى جێگیر دەکەین کە بریتییە لە [ عَدل ] الله سبحانه وتعالى سیفەتی [ عَدل ]ی هەیە ، { لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَاَ نَومُ } الله سبحانه وتعالى نە ئەوەیە خەوی هەیە نە سەرخەو شکاندنی هەیە ، هیچ بەهیچ جۆرێک ، واتە کەم تا زۆر الله سبحانه وتعالى بەهیچ جۆرێک سیفەتی خەونی نیە واتە ناخەوێت نوستن لە بۆ الله سبحانه وتعالى نیە ، ئەو

سیفەتەی نیە ، کەواتە ئێمە لە بەرامبەر ئەوەدا سیفەتی چی جێگیر دەکەین ؟ [ حیات [ زیندوو ، زیندوو ] حی القیوم ] واتە : هەر سیفەتێک نەقصە یکی تێدابوو بۆ الله سبحانە وتعالی ئێمە نەفی دەکەین لە بەرامبەردا پێچەوانەکەی جێگیر دەکەین بۆ الله سبحانە وتعالی ، واتە : پێچەوانەی ئەو سیفەتە ناتەواوە کە سیفەتێک تەواوە پێچەوانەکەی جێگیردەکەین بۆ الله سبحانە وتعالی .

## بنچینەی نۆزدەیەم :

الصفات التي هي كمال بإعتبار ونقص بإعتبار

تثبت لله حال كمالها وتنفى عن الله حال نقصها

واتە : ئەڵێین هەندێک سیفات هەن لە قورئان و لە سونەت بە ( مووقەیەد )ی هاتوون بە( موطلەق )ی ناتوانین بۆ الله سبحانه وتعالى بەکاری بهێنین .

واتە : لە بەرامبەر کاروکردەوەی بەندەدا الله سبحانه وتعالى جەزای ئەوانی داوەتەوە بەهەمان ئەو فعلەیی کە ئەوان کردوویانە ، بۆ نمونە: { وَمَكَرُوا وَمَكَر ٱلله - وَ ٱللهُ خَيرُ الماكرين } * { إنَهُم يَكيدونَ كَيدا - وَ أكيدُ كَيدا } سیفەتی [ كَيد ] سیفەتی [ مَكر ] سیفەتی [ الاستهزاء ] { قالوا إنا مَعَكُم - إنَما نَحنُ مُستَهزِئون } ئەوجا مووشریکین دەیان وت چی ؟ مونافیقین کە دەهاتن بۆلای ئیمانداران دەیان وت ئێمە ئیمانمان هێناوە کە دەگەڕانەوە بۆلای سەرانی کوفر دەیان وت ئێمە لەگەڵ ئێوەداین ، بەلام ئێمە گاڵتەمان پێکردن ، ئێمە [ إستهزاء ] یان پێ دەکەین ، الله سبحانه وتعالى دەفەرمووێت : { واللهُ يَستَهزئُ بِهِم } بەڵکو الله تعالى [ أستهزاء ] بەوان دەکات عزوجل ، کەواتە لە بەرامبەر فعلی بەندەیا بە مووقەیەدی واتە مووقەیەدە بە فعلی ئەوانەوە

له جەزای كار و كردەوەیی ئەوانە الله سبحانه وتعالی بەهەمان شێوەیی ئەوان مامەڵەیان لەگەڵدا دەكات ، لەم كاتەدا دەتوانین ئەم سیفەتە جێگیر بكەین بۆ الله سبحانه وتعالی ، واتە لە جەزایا بەڵام لە ئیبتیدایا بڵێین بە مووطلەق الله سبحانه وتعالی خاوەنی سیفەتی [ كَیدَ ، مَكر ، استهزاء ] ئەمە دەبێتە نەقص بۆ الله سبحانه وتعالی ، تەنها لەو حاڵەتەیا دەبێتە سیفەتی كەمال كە الله سبحانه وتعالی لە بەرامبەر فعلی بەندەیا بەكاری هێناوە وەكو جەزاء وە ئەمەش ئەو پەڕی عەدالەت و دادپەروەری الله سبحانه وتعالی یە نەك ئەوەی الله سبحانه وتعالی بەرامبەر بە هەموو بەندەكانی سیفەتی [ كَید ]ی هەبێت یان [ مَكر ] یان [ استهزاء ]ی هەبێت ، نەخێر ،بەرامبەر بەكەسانێك ئەو سیفەتەیی هەیە وەكو جەزاء كە ئەوان ئەو سیفەتە بەرامبەر بە ئیمانداران و موسوڵمانان بەكاری دەهێنن الله سبحانه وتعالی ـش لە جەزای كار و كردەوەی ئەوانە بەهەمان شێوە مامەڵەیان لەگەڵدادەكاتەوە ، { فَاليومَ نَنساهُم كَما نَسُوا لقاء يَومِهم هذا } موشریكین و بێ باوەڕان كاتێك دەعوە و بانگەوازیان دەكرا بۆ اسلامەتی و بۆ تەوحید بۆ عیبادەتی الله سبحانه وتعالی بە تاك و تەنها شتەكەیان لەبیری خۆیان دەبردەوە ئەیانزانی حەقیقەتەكە بەڵام لەبیری خۆیانیان دەبردەوە و وەك ئەوەی كە نەیان بیستبێت ، بەڵام لە حەقیقەتدا دەیانزانی و بەئاگابوون بۆیە الله سبحانه وتعالی لە قیامەتدا دەفەرموێت { فَاليوم نَنساهُم } ئێمەش ئەوان لەبیر دەبەینەوە

، لێرەدا ناتوانین بڵێین بۆ نمونە سیفەتی [ نسیان ] بۆ الله سبحانه وتعالی جێگیرناکەین بڵێین ئەم [ نسیان ]ە واتە لەب یرچوونەوە بە واتایی ( غەفڵەت و جەهل و نەزانین )دێت ، لە بیری چووە عیاذ بالله ، الله تعالی ئەو سیفەتەی نیە شتی لەبیربچێتەوە یان غافڵ و جاهل و بێ ئاگابێت ، کەواتە ئەمە نەفی دەکەین لە الله سبحانه وتعالی دا ، بەڵام ئەگەر بوترێت ئەو [ نسیان ]ە بەواتایی ( تەرک ) دێت ، واتە الله سبحانه وتعالی تەرکیان دەکات وازیان لێ دەهێنێت لە ئاگردا بسوتێن ، وەکو ( موجاهید ) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێت ، کەواتە لە بەرامبەر ئەوەیی کەوان بەرنامەیی الله سبحانه وتعالی یان لە بیر بردۆتەوە الله سبحانه وتعالی ئەوان تەرک دەکات وازیان لێ دەهێنێت لە ئاگردا بسوتێن ، کەواتە ئەم سیفەتانەیی کە بە ( مووقەیەدی ) هاتوون واتە پەیووەستن بە فعلی بەندەوە بەڕووداوێکەوە ئێمەش بەوشێوەیە بە (مووقەیەد )ی بەکاری دەهێنین و دەبێتە سیفەتی کەمال بۆ الله سبحانه وتعالی ، بەڵام ئەگەر بە ( موطلەق ) بەکاری بهێنین ئیبتدائی سەرەتایی بڵێین الله سبحانه وتعالی خاوەنی ئەو سیفەتەیە بەموطلەق ئەوە دەبێتە نەقص و بۆ الله سبحانه وتعالی جێگیری ناکەین .

## بنچینەی بیستەم :

المضاف إلى الله إن كان لاينفصل فإضافة الصفة ، وإن كان منفصلا فاضافة التشريف والتكريم

واته : ئەڵێین کۆمەڵێک سیفات هەن کۆمەڵێک له بابی ( مُضاف ) کۆمەڵێک شت هەن ( اضاف )ـه کراون بۆ الله سبحانه وتعالى له دوو ڕووووەوە سەیری دەکەین ( اضاف )ـه یەکمان هەیه پێی دەوترێت ( اضاف صفات ) ئیزافەی سیفات ، واته ئەگەر اضافەت دایه پاڵ الله سبحانه وتعالى دەبێته [ سیفەت بۆ الله سبحانه وتعالى ] ئەگەر داته پاڵ الله سبحانه وتعالى ، واته شتێکت دایه پاڵ الله سبحانه وتعالى ، بەڵام هەندێ شتی کەمان هەیه الله سبحانه وتعالى دەیداته پاڵ خۆی بەڵام پێی ناوترێ [ سیفەت ] بۆ نموونه دەوترێت [ دەستی الله سبحانه وتعالى ] [ چاوی الله سبحانه وتعالى ] [ ڕەحمەتی الله سبحانه وتعالى ] { وَ رَحمَتي وَسِعت كُلَّ شيء } ئەمانه پێی پێیان دەوترێت [ إضافاتی صیفه ] واته دراوەته پاڵ الله سبحانه وتعالى وەسیفەتیشن بۆ الله سبحانه وتعالى ، ( دەستی الله سبحانه وتعالى ، ڕەحمەتی الله سبحانه وتعالى ، چاوی الله سبحانه وتعالى ) ئەمانه سیفەتن ، بەڵام کۆمەڵێکی دیکەمان هەیه له ( اضافات ) پێی ناوترێت سیفەت ، بۆنمونه { هذه ناقة الله } { وَنَفَخنا فيه رُحنا } ( رُح ) یانی جبريل عليه السلام بەڵام الله تعالى دەفەرمووێت

اضافەی داوەتە پاڵ خۆی ئەمە پێی دەوترێت [ **اضافەی تەشرف** ] وەکو ڕێزگرتن وەکو بە گەورە دانانی ئەو شتە ، ( بَیتُ اللە ) ماڵی اللە سبحانە وتعالی واتای ئەوەنییە ئەم ماڵە سیفەتێک بێت بۆ اللە سبحانە وتعالی نەخێر ، بەڵکو وەکو ئەوەی کە اللە سبحانە وتعالی اضافەی کردووە وەکو ڕێزلێگرتنێ وەکو تەشریفێ وەکو بەگەورە دانان و تەماشاکردنی بەوشێوەیە کە پێویستە نەک ئەوەی بوترێ سیفەتێکە بۆ اللە سبحانە وتعالی ، کەواتە لەم بنچینەیا دوو شت هەیە ( ١ ) ئەوەی کە اضافە دەدرێتە پاڵ اللە سبحانە وتعالی ، مەرج نیە سیفەت بێت هەمیشە نەخێر هەندێک جار سیفەتە بۆ اللە سبحانە وتعالی ، دەبێتە سیفەتی اللە سبحانە وتعالی ، ( ٢ ) هەندێ جاریش اضافە دەدرێتە پاڵ اللە سبحانە وتعالی ، بەڵام سیفەت نیە بۆ اللە سبحانە وتعالی ، بەڵکو اضافەی ئەوەی کە دراوەتە پاڵ اللە سبحانە وتعالی وەکو بەڕێز تەماشاکردنی و بە گەورە زانینی و بەرزی مەکانەت و پلەو پاییەتی ، **{ناقَة اللە }** وشتری اللە سبحانە وتعالی ، یانی ئەو ئاژەڵە اللە سبحانە وتعالی اضافەی کردووە بۆ لای خۆی ، بەڵام ئەمە پێی ناوترێ سیفەتی اللە سبحانە وتعالی عیاذا باللە ، بەڵکو بە گەورە تەماشاکردنی ئەو شتەیە کە اللە سبحانە وتعالی اضافەی کردووە بۆ لای خۆی سبحانە وتعالی ڕێز لێگرتنی ئەو شتەیە و بەرز تەماشاکردنی مەکانیەتی .

## بنچینەی بیست و یەکەم :

مالم يرد فيه دليل بخصوصه فلا نثبت لفظه ولا ننفيه ونستفصل في معناه فإن أريد الحق قبلناه وإن أريد الباطل رددناه.

واتە : ئەڵێین بۆ نمونە لەفضەیێک هاتووە بەڵام ئەم لەفضە دەلیلێکی لەسەر نیە بەتایبەتکردنی ئەو لەفضە بەو شێوەیەی کە هێیت دەلیلی لەسەربێت ، ئێمە نایەین نەفی کەین یان أثبات یکەین بەڵکو تەفصلی پێ ئەیەین تەماشای ئەکەین بزانین ئەگەر مەبەستەکە [ حەق ] بێت ئەوە قەبووڵی دەکەین ئەگەر مەبەستەکە [ باطل ] بێت ڕەدێی دەدەینەوە ، بۆ نمونە ئەوترێیت ( للهِ مكان ) واتە الله سبحانه وتعالى مکان ی هەیە ، ئەم [ مكان ]ە یان ئەگەر مەبەست پێی مەکانێکی نزم بێت ( سُفل ) بێت ئەمە باطلە واتە : یەک سەرنایەین ڕەدی دەینەوە بڵێین الله سبحانه وتعالى مەکانی نییە یان هەیەتی ، نەخێر ، بەڵکو دێین تەفصیلی پێ ئەدەین بزانین مەبەست چییە لە (مەکان ) ئەگەر مەبەست پێی [ نزمایی ] بێت ئەوە ئێمە نەفی ئەکەین بۆ الله سبحانه وتعالى ، ئەگەر مەبەست پێی ( علو ) بێت بەڵام ئەو مەکانە ئیحاطەی الله سبحانه وتعالى یکردبێت واتە الله سبحانه وتعالى لەناو مەخلوقاتدا بێت ئەو مەکانە دەوری الله سبحانه وتعالى دابێت دیسانەوە دەڵێین [ باطلە ] با مەکانێکی بەرزیش

بێت ، بەڵام ئەگەر وترا مەبەست پێی ( علوَ ) بەرزیە بەڵام الله سبحانە وتعالی لە دەرەوەی مەخلوقات بێت ، کە دەڵێین مەکان واتە جێگیرکردنی ئەوەی الله سبحانە وتعالی لە بەرزیەو لەسەر عەرشە لەدەرەوەی مەخلوقاتە ئەو کاتە ئەڵێین واتاکە [ حەق ]ە چونکە مەخلوقات [ غَیرَ مُحِطن بالله ] ئیحاطە ناکات بە الله سبحانە وتعالی لاوە ، کەوابوو ئەو لە فضانەی دەلیلیان لەسەر نییە بەکار دەهێنرێن بۆ الله سبحانە وتعالی [ نە نەفی دەکەین نە اثباتی دەکەین ] تاوەکو بزانین مەبەستەکە چییە ، ئەگەر مەبەستەکە حەق بێت قەبووڵی ئەکەین و ئەگەر مەبەستەکە باطل بێت قەبووڵی ناکەین ...

## بنچینەی بیست و دووەم :

### أسماء الله لاتحصر في العدد

واتە : ئەڵێین ناوەکانی الله سبحانە وتعالی لە کۆمەڵێ ژمارەیا کورت هەڵناهێنن ، واتە ژمارەیەکی دیاریکراوی نیە ، ناوەکانی الله سبحانە وتعالی ژمارەیەکی دیایکراوی نییە ، ئەو حەدیثەش کە هاتووە [ الله سبحانە وتعالی نەوەد و نۆ ناوی هەیە هەرکەسێک بیان ژمێرێ و یان لەبەریانکات دەچێتە بەهەشتەوە ] مەبەست پێی ئەوە نییە تەنها ئەو ناوانەی هەبێت بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە هەرکەسێک ئەم ناوانە لەبەرکات لە بەشێک لە ناوەکانی الله سبحانە وتعالی لایا ئەوە پاداشتەکەیەتی ، ئەنا مەبەست ئەوەنیە تەنها ئەم نەوەد و نۆ ناوەی هەبێ بەڵکو الله سبحانە وتعالی خاوەنی کۆمەڵێک زۆر لە أسماء و لە صیفاتە وە دیاریکراو نییەو مەحصور نیە لە کۆمەڵێک ناودا نەوەد و نۆ یە سەدە هەزارە ملیۆنە ئێمە نایزانین .

## بنچینەی بیست و سێیەم :

واجب في أسماء الله إثباتها وإثبات صفاتها والتعبد لله بآثارها

واتە : ئەڵێین ئەم بنچینە سێ شت لەخۆی دەگرێت ( ١ ) ئەڵێین [ واجِبُ فی أسماءِ اللهِ إثباتها ] لە أسماء ی الله سبحانە وتعالی لە ناوەکانی الله سبحانە وتعالی یەکەم شت واجبە لەسەرمان جێگیریکەین واتە اثباتی کەین ئەم اسمە بۆ الله سبحانە وتعالی .

( ٢ ) [ أثباتُ صفاتها ] سیفەتی ئەو اسمە چونکە وتمان [ أسماءُ اللهِ أعلامُ وَ أوصاف ] هەموو اسم ێکی الله سبحانە وتعالی وەسفیشە واتە سیفەتیشی لێ وەردەگیرێ ، کەواتە یەکەم ئێمە اسمەکە جێگیر دەکەین دووەم سیفەتەکە جێگیر دەکەین....

( ٣ ) بە ئاثاروو کاریگەری ئەو اسماء و صیفاتە ئێمە عیبادەت و بەندایەتی دەکەین بۆ الله سبحانە وتعالی ، بۆ نمونە سیفەتی ( رَقیب ) **یەکەم** : بڕوامان بە اسمەکە هەیە ئەڵێین [ رَقیب ] اسم ێکە لە اسماء ی الله سبحانە وتعالی لە ناوی الله سبحانە وتعالی ..
**دووەم** : ئیمانمان بە سیفەتی ئەو [ رَقیب ]ە هەیە کە بریتیە لە چی ؟ سیفەتێکی لە خۆگرتووە کە ڕەقابەی موطلەقەیە [ رَقابَ المطلَق ] بە موطلەقی چاودێرە بەسەر بەندەکانەوە نهێنی و ئاشکرایان ، [ عَلامُ

الغيُب ] ... ، **سێیەم :** [ نَتَعَبَدُ بهذا الاسم ] ئێمە بەندایەتی الله سبحانە وتعالى دەکەین بەهۆی ئەم اسمەوە بەم اسمە ، چۆن ؟ ئیمانمان بە [ رَقیبَ ] کەهەیە کە ناوی الله سبحانە وتعالى لایە ، ئیمانمان بەو سیفەتە هەیە کە الله سبحانە وتعالى چاودێرە بەسەرمانەوە ، کەواتە ئەم سیفەتەی الله سبحانە وتعالى وادەکات لە ئێمە ئێمە بەندایەتی بکەین بەو شێوەیەی کە ڕێگربێت لەوەی کە تاوان ئەنجام بدەین و عەبدایەتی و بەندایەتی بۆبکەین بەهۆی ئەم سیفەتەوە .

## بنچینەی بیست و چوارەم :

اللە موصوف بصفات الكمال والجلال قبل وجود آثارها

واتە : ئەڵێین اللە سبحانە وتعالی وەسف ئەکرێ بە تەواوی ئەو سیفەتانەی کە لە قورئان و سونەت ـدا بەیان کراون کە بۆ خۆی جێگیری کردوە و رسول اللە صلی اللە علیە وسلم باسیکردووە و جێگیری کردووە بۆ اللە سبحانە وتعالی پێش ئەوەی کاریگەری سیفەتەکە دەربکەوێت ، بۆ نمونە ئەڵێین : اللە سبحانە وتعالی [ غَفور ] ـە ، پێش بوونی تاوانیش اللە سبحانە وتعالی غفور ـە بۆ کەسی تاوانبار بۆ تاوان لێ خۆشبووە لەو کەسەی کە تاوان دەکات سرەڕەوەی تاوانە ، بەڵام پێش ئەوەی تاوانەکەش ئەنجام بدرێت اللە سبحانە وتعالی هەر وەسف کراوە بە سیفەتی غەفوور ، اللە سبحانە وتعالی وەسف کراوە بەسیفەتی [ ربوبية ] پێش ئەوەی مەربووب بوونی هەبێت ، اللە سبحانە وتعالی [ تَواب ]ـە پێش ئەوەی زەمبوو تاوان بوونی هەبوو بێ و بەندە داوای تەوبە لە اللە سبحانە وتعالی بکات ، ناکرێت اللە سبحانە وتعالی وەسف بکەین بە سیفەتێکی( نویێ ) چونکە ئەسەرەکەی پەیدابووە ، وەسف وەسفی اللە سبحانە وتعالی سیفاتی اللە سبحانە وتعالی پەیوەست نییە بە اثارەوە ،[ مَوصُفُ وَ إن لَم تُوجَد اثاروها ] اللە سبحانە وتعالی وەسف ئەکرێ بەتەواوی سیفەتەکان

که سیفەتی کەمال ـن کە سیفەتی گەورەن سیفەتی بەرزن بۆ خۆی جێگیری کردووە لە قورئاندا و رسول الله لە سونەتدا صلى الله عليه وسلم ، بە خیلافی ئینسانەوە بەندەوە لله المثل الأعلى ، ناکرێت بووترێت ئینسانێک وەسفیکەی بە قسەکردن بە کەلام بە گفتوگۆ ئیلا ئەبێت قسە بکات ئەوجا ئەڵێی ئەم ئینسانە چییە ؟ قسەکەرە قسە دەکات ، یان بەرێز هەتاوەکو رێزی لێ نەبینی ناتوانیت بڵێیت ئەم ئینسانە بەرێزە واتە چ کاتێک دەڵێت ئەم ئینسانە کەسێکی بەرێزە ؟ ئەو کاتەی کە رێزی لێ ئەبینیت ، کەوابوو سیفاتی کەمالی ئینسان مەربوطە بەچییەوە ؟ بە ئاثارەکەیەوە بە کاریگەریەکەیەوە دەبێت دەربکەوێت بوونی ئەو سیفەتە ئەثەری ئەو سیفەتە دەرکەوێت لەو کەسەدا ئەو کاتە وەسف دەکرێت ، بەڵام الله سبحانه وتعالى بە خیلافە بە خیلافی ئێمەیە بەخیلافی ئینسانە لله المثل الأعلى پێش ئەوەی کاریگەری سیفەتەکە دەرکەوێ وەسف دەکرێت بەو سیفەتە .

## بنچینەی بیست و پێنجەم :

أهل السنة يثبتون صفات الكمال على وجه التفصيل وينفون صفات النقص على وجه الإجمال

واتە : ئەڵێین ئەهلی سونە ئەو سیفەتانەی کە سیفەتی [ کەمالن ، سیفەتی بەرزین،سیفەتی تەواون ، سیفەتی عولیان ، سیفەتی حوسنان] جێگیری دەکەن بۆ الله سبحانه وتعالى لەسەر وەجهی [ تەفصل ] واتە: درێژەی پێدەدەن باسی دەکەن بە تەفصیلی بەڵام ئەو سیفەتانەی کە سیفاتی نەقص ـن کەوتمان الله سبحانه وتعالى کە هیچ سیفەتێکی نەقص ی نییە کاتێک کە نەفی دەکەین لە الله سبحانه وتعالى لەسەر وەجهی [ اجمال ] واتە : بەشێوەیەکی [ إختصار ] بەشێوەیەکی کورت هەڵهێن ئێمە باسی ئەو سیفەتە ئەکەین کە نەفی دەکەین بۆ الله سبحانه وتعالى ، بۆ نموونە لله المثل الأعلى ، ئەڵێین چی ؟ ئەگەر کەسێک بە پاشایەک بڵێ بەکەسێکی خاوەن دەسەڵات پێی بڵێ [ **تۆ کەسێکی ئازایت تۆ کەسێکی بەڕێزی ، تۆ کەسێکی بەخشندەی مهرەبانی ، لێخۆش ، گەورەی ، بووی بەرەحمی ، دڵێکی وەهات هەیە** ] کۆمەڵێک لەم سیفەتانە بێگومان ئەم کەسە پێی خۆشە بۆچی ؟ چونکە تۆ تەفصیل تداوە بەم سیفەتە باشانە یەکە یەکە بۆت باسکردووە بەیانت کردووە هەتا زیاتر

باسی چاکەکانی بکەیت و باسی سیفەتە باشەکانی بکەیت پێی خۆشە ، لله المثل الأعلى کەواتە جوانتر و ئەولاترە الله سبحانه وتعالى بەو شێوەیە وەسف بکرێت ، ئەگەر بۆ ئینسانێک وابێت الله سبحانه وتعالى بێگومان ئەحەقتر و ئەولاترە { لَيسَ كَمثلِه شيء } ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾ [الحشر ٢٣] ، الله سبحانه وتعالى چی کرد ؟ تەفصل دابە سیفەتە کەمالەکان سیفەتە بەرز و بڵندەکان ، باشە ئەگەر ئەو کەسە بێت کە وەسفی ئەم پاشاییەی کردووە بڵێ [ **تۆ کەسێکی ترسنۆک نیت ، تەمەڵ نیت ، لاواز نیت ، دزی ناکەیت ،زینا ناکەیت ، عارەق ناخۆیتەوە ، قۆڵی خەڵک نابڕیت ، خوێنی خەڵک نارژی** ] خۆ قسەکانی ڕاستن ئەم سیفەتانەی تێدا نییە بەڵام بەم شێوەیە جوان نیە کەمی ئەدەبە ، چونکە باشتر وایە بڵێ تۆ سیفەتی خراپت نییە نەک یەکە یەکە باسی سیفەتە خراپەکان بکات بڵێ ئەمەت نییە ئەمەت نییە ، نەخێر بەڵکو باشتر و جوانتر وایە بە یەکە یەکە دانە دانە بە شێوەیەکی تەفصل باسی سیفەتە کەمال و تەواو بەرزوو بڵندو مەزنەکانی بکات جوانەکانی بکات ، لله المثل الأعلى الله سبحانه وتعالى ئەحەقترە لەوەی کە بەم شێوەیە وەسف نەکرێت ، جونتر وایە کە سیفەتە کەمال و تەواوەکانی تەفصل ی پێ بدرێت کەوابوو ئەو سیفەتانەی کە نەقص ن کاتێک کە نەفی دەکەیت بەشێوەیەکی پوخت نەک بەشێوەیەکی تەفصل ی نەفی بکەی ، بۆ

نمونه الله تعالی دەفەرمویّت { وَلَم يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحَدُ } فەرموی { أَحد }
دانه دانه باسی نەكرد الله سبحانه وتعالی له ئینسان ناچێ له فلآن ناچێ
لەو ناچێ ، نەخێر ، فەرمووی { لَم يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحدُ } { هَل تَعلَمُ لَه سَمِيا
} { لَيسَ كَمِثل شيء } { فَلا تَجعَل للهِ أَندادا } { لا تُشرِك بِهِ شيء } نەی
فەرموو [ لا تُسرِك بِهِ قَبر ، الملائكه ] نەخێر ، فەرمووی { لا تُشريك بِهِ
شيئا } هیچ شتێك مەكە هاوبەشی الله سبحانه وتعالی ،
بەشێوەیەكی چۆن باسی كرد ؟ بەشێوەیەكی ئیجمالی به
شێوەیەكی پوخت ، نەهات دانه دانه باسی بەكات ، نەی فەرموو [
**ئەستێرە مەپەرستن مەكەن به هاوبەشی الله سبحانه وتعالی ،**
**مەلائیكه نەكەن بەهاوبەشی الله تعالی ، قەبر مەكەن**
**بەهاوبەشی الله تعالی ، دارو ئاسمان و خۆرو مانگ ئەمانه و بەقای**
**ئەوانی كه مەكەن بەهاوبەشی الله تعالی** ] نەخێر ، فەرمووی { لا
تُشرِك بِهِ شيئا } هیچ شتێك تەواو ، نەی فەرموو [ لَيسَ مَلائِكَة كَمِثلِ ]
بۆ نموونه ، فەرموی { لَيسَ كَمثلِه شيء } تەواو براندیەوە به شێوەیەكی
اجمالی به شێوەیەكی پوخت فەرموی هیچ شتێك هاوشێوەی الله
سبحانه وتعالی نییه ، ئەم بنچینه بنچینەیەكی ( كولی )نییه واته سەد
لەسەد بەلآم بنچینەیەكی ( ئەغلەبیه ) واته له زۆرینەی حاڵەتەكاندا
بەم شێوەیه ، واته دەگونجێت عەكسی بنچینەكەشمان هەبێت بەلآم
زۆر بەكەمی ، بۆنمونه ئێمه وتمان ئەو سیفەتانەی كه سیفەتی (
كەمال )ن سیفەتی بەرزین ئەو سیفەتانەنن كه بۆ الله سبحانه

وتعالی جێگیری دەکەین بەشێوەیەکی چی باسیان دەکات ؟
بەشێوەیەکی تەفصلی واتە تەفصلی پێ دەدەین بەشێوەیەکی گشتی
باسی دەکەین وەکو چۆن لە اسماء کاندا لە ئایەتەکەدا
خوێندمانەوە ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِی لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ
ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ﴾ بەشێوەیەکی تەفصل الله
سبحانه وتعالی باسیکرد ، بەڵام پێچەوانەی ئەوەشمان هەیە { وَللهِ
الأسماء الحسنى فَادعُوه بها} الله تعالی دەفەرموێت خاوەنی کۆمەڵێک
چییە ؟ الله سبحانه وتعالی کۆمەڵێک ناوی [ حُسنا ]ـیە
ناوەکانی بە شێوەیەکی ( اجمال )ی باس کردووە ، کەواتە إثباتی
کەمال لێرەیا بەشێوەیەکی چییە ؟ بەشێوەیەکی موجمەلە بەس
خۆی بنچینەکەی ئێمە وتمان [ إثباتی کەمال ] بەشێوەی چییە ؟ [
تەفصلە ] ، ئێمە وتمان نەفی نەقص واتە سیفەتی ئەوسیفەتانەی کە
نەقص ن بۆ الله سبحانه وتعالی کاتێک نەفی دەکەین بەشێوەیەکی
چی نەفی دەکەین ؟ بەشێوەیەکی [ اجمال ]ی واتە بەشێوەیەکی
موجمەل ، بەڵام سیفەتی نەقصمان هەیە بەشێوەیەکی [ موفەصەل ]
الله سبحانه وتعالی نەفی کردووە ، بۆ نمونە { ما اتخذ صاحبة وَلا وَلَدا }
الله سبحانه وتعالی نە هاوسەری هەیە نەمنداڵی هەیە، وەکو ( طبری
)لە تەفسیرەکەیدا دەیڵێ..

## بنچینەی بیست و شەشەم :

صفات الله ذاتية و فعلية

واتە : ئەڵێین سیفاتەکانی الله سبحانه وتعالى سیفاتی [ زاتین ، فعل ]ین ، سیفاتی [ زاتی ] واتە موتەعەلیقە بە نەفسی الله سبحانه وتعالى بەزاتی الله سبحانه وتعالى ، بۆنموونە ( عَین ، وَجه ، رِجل ، يَد ، أَصابع ، صَدر ، ذراع ) ئەمانە سیفەتی زاتین واتە سیفەتێکن ( موتەعەلیقن )بە زاتی الله سبحانه وتعالى واتە پەیوەستن بە نەفسی الله سبحانه وتعالى وە ، بەڵام سیفاتی [ فعل ]ی موتەعەلیقن بە فعل ـەوە کە الله سبحانه وتعالى ئەنجامی ئەدات هەر کاتێک کە بیەوێت ، بۆ نموونە سیفەتی [ غَضَب ، رِضا ، ضَحِك ] ئەوسیفەتانەی کە پەیوەستن بە فعلی الله سبحانه وتعالى ـوە ،سیفەتی [ نزُل ] سیفەتی [ استواى ] ئەمانە سیفاتی فعل ی الله سبحانه وتعالى ـن ،واتە الله سبحانه وتعالى هەر کاتێک ویستی لێ بێت ئەنجامیان ئەدات ، **کەواتە دوو جۆر سیفەتمان هەیە** ، سیفاتی الله سبحانه وتعالى سیفاتی [ **زاتی و فعل** ]ی ، لله المثل الأعلى ئنسان بۆنموونە [ تورە دەبێت، پێ دەکەنێت، ئەڕوات، هەڵەسێت ، دائەنیشێ ] ئەمانە کارو کردەوەی ئنسانن ئەمە سیفەتی ئنسانن ،

ئەڵێن ئەم ئینسانە سیفەتی وایە [ **زوو تورە دەبێت ، زۆر پێ دەکەنێت ، زۆر قسە دەکات ، زۆر کەسێکی نامۆیە ، زۆر کەسێکی داخراوە** ] ئەمانە سیفاتی( فعل )ی ئەو کەسەن ، بەڵام ئەڵێیت [ **چاوی جوانە ، باڵای بەرزە ، ڕووخساری گەشاوەیە** ] ئەمانە سیفاتێکی چین ؟ سیفاتێکن پەیوەستن بە خودی کەسەکەوە ، پەیوەست نیە بەوەی کە ئەم کەسە ئەم کارانە ئەنجام دەدات ببێت بە وەکو سیفەتێکی کرداری وەک سیفەتێکی فعلی نەخێر ، بەڵکو پەیوەستە بە نەفسی کەسەکەوە ، لله المثل الأعلى {لَيسَ كَمثلِه شيء } { وَلَم يَكُن لَهُ كُفُواً أَحَدُ } نمونەکان تەنها بۆ ئەوەیە ڕوونتر تێبگەین ، الله سبحانه وتعالى کۆمەڵێک سیفاتی هەیە [ **فعل**]ین واتە کردارین ئەنجامیان دەدات هەرکاتێک بیەوێت ویستی لێبێت { مَتا شاء } سیفەتی [ تورەبوون ، پێکەنین ،ڕەزامەندی ، قسەکردن ] ئەمانە سیفاتی **فعل** ین .

## بنچینەی بیست و حەوتەم :

### أسماء الله تعالى أعلام وأوصاف

واتە : ئەڵێین ناوەکانی الله سبحانه وتعالى هەم ناسراون هەم سیفەتیش لە خۆ دەگرن ، وتمان هەموو ناوێکی الله سبحانه وتعالى سیفەتیش لەخۆدەگرێت ، بەڵام هەموو سیفەتێک ناو لەخۆناگرێت ، کاتێک ئەڵێن [ سلام ] ناوی الله سبحانه وتعالى یە کەواتە ئەڵێن [ سلام ] سەلامەتە لەچی ؟ [ مِن کُلِ عیبً ] واتە سیفەتیشی لێ وەردەگیرێت ، کەواتە هەموو ناوەکانی الله سبحانه وتعالى [ **هەم ناسراون** ، **وە هەم سیفەتیشیان لێ وەردەگیرێت** ] واتە هەم ناویشن هەم سیفەتیشن وە ناسراو یشن .

## بنچینەی بیست و هەشتەم :

### كل ميل عما يجب اعتقاده في أسماء الله و آياته فإلحاد

واتە : ئەڵێین هەموو لادانێک لەوەی کە پێویستە و واجبە ئیعتقادت لە اسماء و لە سیفاتی الله سبحانه وتعالى دا دامەزرێنیت لەسەری یان لە ئایەتەکانی الله سبحانه وتعالى لایا ئەوە دەبێتە [ ئیلحاد ] هەموو لادانێک جا ئەو لادانە ئایا ئینکاری کردنی ئەم اسمە بێت ئایا ئینکاری کردنی ئەم سیفەتە بێت کە ئەو اسمە لەخۆی گرتووە یان ئەوەبێت بەسەر مەخلوقاتدا بەکاری بهێنی ئەوەش دووبارە دەبێتە [ ئیلحاد ] بۆ نمونە الله سبحانه وتعالى سیفەتی چی هەیە؟ [ سلام ]ی هەیە [ عَزيز ، جَبار ، مُتَكبر ، ماليك ، قودوس ] ئەو سیفەتانە تەواوی سیفەتەکانی الله سبحانه وتعالى ، یان اسماء کانی الله سبحانه وتعالى کە ئینکاری ئەمانەت کرد ئەوە توشی [ ئیلحاد ] بووی لە اسماء و صفاتی الله سبحانه وتعالى ، یاخوود بێیت ئەم اسمانەی الله سبحانه وتعالى یان سیفاتەکانی الله سبحانه وتعالى بەکاربێنی بەسەر

مەخلوقاتدا ، بۆ نمونە ئەوانەی کە موشریکینی قورەیش دەیان پەرست [ لات و عوزا ] [ عوزا ] ئەوتریّ لە[ عَزيزَ ]وە هاتووە، [ عزيز ] سیفەتی الله سبحانه وتعالى ـدا کەواتە ئەوان هاتن [ عوزا ]ـیان ئەو سیفەتە کە سیفەتی الله سبحانه وتعالى بوو [ عزيز ] بەسەر چییاندا سەپاندیان ؟ بۆچی بەکارین هێنا ؟ بۆ مەخلوقات بۆ بتێک بەکاریان هێنا عیاذا بالله ، بۆیە توشی چیبوون ؟ توشی ئیلحاد بوون لە اسماء و سیفاتدا، [ لات ] لە چییەوە وەرگیراوە ؟ لە [ اله ] وەریانگرتووە ، لەناوی الله سبحانه وتعالى وە وەریانگرت بەڵام بۆ ئیلاهەکان بەکاریان هێنا واتە بۆ مەخلوقات بەکاریان هێنا ، کەواتە توشی چیبوون لەو بابەتەیا ؟ توشی ئیلحاد بوون ، یاخود بێت ناوی الله تعالى بنێیت بەوەی خۆی ناوی خۆی پێ نەناوە واتە اسم یێک بخیتە پاڵ الله سبحانه وتعالى کە الله سبحانه وتعالى خاوەنی ئەو ناوە نییە وەسف نەکراوە بەو سیفەتە کە ئەو ناوە لە خۆیی دەگرێت ، بۆنمونە نەصارا مەلاحیدەن بۆچی ؟ چونکە الله سبحانه وتعالى ناو دەنێین بەچی ؟ بە [ باوک ] عیاذ بالله ،دەڵێن الله سبحانه وتعالى باوکە ئایا الله سبحانه وتعالى ئەم ناوەی هەیە ؟؟ ئەم سیفەتەی هەیە ؟ نەخێر ، کەواتە شتێکیان داوەتە پاڵ الله سبحانه وتعالى کە خۆی بۆ خۆی قەراری نەداوە ،کەواتە توشی ئیلحاد بوون لەم بابەتەدا ، کەوابوو هەر جۆرە لادانێک لە اسماء و سیفاتی الله سبحانه وتعالى بەوەی کەوا واجبە عقیدەتی لەسەر دابمەزرێنی توشی چی دەبیت ؟توشی ئیلحادت دەکات . پەنا بە الله سبحانه وتعالى

## بنچینەی بیست و نۆیەم :

## كل مايفرضه العقل على صفات الله من اللوازم الباطلة  فمن قذارة التمثيل

واتە : بەداخەوە ئەوەی کە زۆر جار مرۆڤ بەرەو هەڵدێران دەبات لە ئعتيقاد و بیروباوەڕیـــدا بە تايبەتی کەسانێک کە ئینتسابی خۆیان دەدەنە پاڵ اسلام پاڵ میلەتی ابراهيم عليه الصلاة والسلام خۆیان بە شوێنکەوتەی محمد صلى الله عليه وسلم دەزانن ، ئەکەونە ناو گومڕاییەکەوە ناو تاوانێکەوە کە بەڕاستی لێ خۆشبوونی نیە ئیلا بە تەوبە نەبێت وە نەگەڕێتەوە سەری وەئەگەر لەسەری بمرێت تەوبەی لەسەر نەکات لێ خۆشبوونی الله تعالى نایگرێتەوە ، ئەویش بریتیە لە [ هاوبەش دانان ] شیرک بۆ الله سبحانه وتعالى ، لە قەزیە ی شیرک و هاوبەش داناندا بۆ الله سبحانه وتعالى بەهۆی چییەوە ڕوو دەدات ؟ بەهۆی [ تەمثل ]ەوە ڕوودەدات ، باسەکەی ئێمەش لێرەدایە ، ئەڵێین : هەموو ئەوەی کە عەقڵ دەیداتە پاڵ الله سبحانه وتعالى یانی

ژیری ئینسان ئەوەی کە خۆی ناویناوە ژیری ، ئەگینا بەڕاستی ژیری نییە کاتێک بەرەو ئەو هەڵدێرانە بڕوات بکەوێتە ئەو چاڵ و ئەو تاریکایەوە ، ئەڵێین هەموو ئەوەی کە عەقڵ دەیداتە پاڵ الله سبحانه وتعالی لە کۆمەڵێ سیفات بەڵام ئەو سیفەتانە سیفەتی نەقص ن ، سیفەتێکی ناشرینن بۆ الله سبحانه وتعالی با بە هۆشمەندی و بیرو و لۆژیکی خۆی ئەم کەسە پێی وابێت کە شتێکی باشیکردووە ،بەڵام لە حەقیقەتدا شتێکی باطلی کردووە ، بەهۆی چییەوەیە کە ئەم سیفەتە نەقصە دەداتە پاڵ الله تعالی بەهۆی تەمثیل ـەوەیە واتە بەهۆی شوبهاندنی الله سبحانه وتعالی یە بە بەندەیەک بە عەبدێک بەغەیری خۆی ، واتە شوبهاندنی الله سبحانه وتعالی ـە بە مەخلوقات ، یان ئەوەیە مەخلوقات بشوبهێنیت بە الله سبحانه وتعالی ، بۆ نمونە ئەوانەی کە قەبرێک دەپەرستن عیبادەتی بۆ دەکەن هاناو هاواری بۆ دەکەن تەواقی بە دەورا دەکەن لێی دەپاڕێنەوە قوربانی بۆ دەکەن ، ئەمانە ئەم قەبرەیان کردووە بە تەمثل ـــیان کردووە بە الله سبحانه وتعالی ، هەموو ئەوەی کە لە الله سبحانه و تعالی ـدا هەیە پێویستە بۆ مەعبوودی ڕاستەقینە ئەنجام بدرێت کە بریتیە لە الله سبحانه وتعالی ئەمان بۆ غەیری ئەو ئەنجامی دەدەن ، بۆچی ؟ چونکە پێیان وایە ئیلاهییەت لەم کەسەیا هەیە ، عیبادەتی بۆ دەکەن لەو شەخسەدا هەیە لەو دارە لەو بردە لەو قەبرە لەهەرشتێک کە عیبادەتی بۆدەکرێیت لە غەیری الله سبحانه وتعالی ، کاتێک کە تۆ

عیبادەتێکت بۆکرد شوبهاندووتە بە الله سبحانە وتعالی ،چونکە عیبادەت تایبەتە بۆ الله سبحانە وتعالی دەبێت تەنها بۆ الله جێبەجێ بکرێت سبحانە وتعالی ،ئەی ئەگەر بۆ غەیری ئەوت جێ بەجێ کرد کەواتە تۆ ئەم شتەت تەمثل کردوە بە الله سبحانە وتعالی ، ئەوانەی کە [ عیسی ــیان ] علیه السلام دەپەرست یان کە دەیپەرستن لە ئێستاشدا وە بە ئیلاهی دەزانن ، چونکە عیسا ـیان علیه السلام تەمثل کردووە بە الله سبحانە وتعالی کەوتونەتە ناو گومڕای تەمثلەوە ، کەواتە کوفری ئەوان بەهۆی چییەوە بوو ؟ بەهۆی تەمثلەوە بوو ، کوفری ئەوەی عیبادەتی غەیری الله سبحانە وتعالی بەهۆی تەمثل ـە ، واتە ئەو شتانە دەشوبهێنن بە الله سبحانە وتعالی ، لە اسماء و لە صیفاتی الله سبحانە وتعالی شدا بەو شێوەیە ، بۆ نموونە کەسێک ئەڵێیت [ استوی ] الله سبحانە وتعالی وەکو [ استوی ] مەخلوقات وایە ،[ دەستی ] الله سبحانە وتعالی وەکو [ دەستی ] مەخلوقات وایە عیاذ بالله ،[ بینینی ] الله سبحانە وتعالی [ بیستنی ] الله سبحانە وتعالی وەکو [ بینین و بیستنی ] مەخلوقات وایە ئەی شوبهێنێت تەمثلی دەکات هاو وێنەی دەکات لەگەڵ مەخلوقاتدا ئەڵێ هەمان شتە وەک چۆن ناوەکەی یەکسانە سیفەتەکەشی هەمان جۆرە ، بەڵام ئێمە وتمان ئەو بنچینە زێرینە کە هەموو جارێ دووبارەی دەکەینەوە الله سبحانە وتعالی بۆی بەیانکردووین { لَيسَ كَمثلِ شيء } هیچ شتێک هاوشێوەی الله سبحانە وتعالی نییە ، بەڵام کاتێک کە دەڵێت ( دەست ) وەکو

( دەستی ) الله سبحانە وتعالی وایە ( ڕووخساری ) وەکو ( ڕووخساری ) الله سبحانە وتعالی وایە ( بینینی ) مەخلوقات وەکو( بینینی ) الله سبحانە وتعالی وایە ، ئەوا مەخلوقاتی تەمثل کردووە لە گەڵ الله سبحانە وتعالی بە هاووێنە و هاوشێوەی الله سبحانە وتعالی دایناوە و هەژماری کردووە ، بۆیە ئەڵێین [ **هەموو ئەوەی کە عەقڵ ئەی داتە پاڵ الله سبحانە وتعالی لە سیفەتە باطلەکان لەو شتانەی کە باطلن ئەدرێتە پاڵ الله سبحانە وتعالی بەهۆی چییەوەیە ؟ بەهۆی تمثیل ـە**] کەوابوو پێویستە خۆمان بپارێزین لە تەمثل لەوەی الله سبحانە وتعالی بشوبهێنین بە مەخلوقات یان مەخلوقات بشوبهێنین بە الله سبحانە وتعالی عیاذ باللە....

## بنچینەی سیـــــــــــەم :

## إشارة التمثيل عند ذكر شيء من صفات الله محرمة و إشارة إثبات الحقيقة جائزة

واتە : ئەڵێین لە کاتی باسکردنی اسماء و سیفاتی الله سبحانە وتعالی ئەتوانیت ئیشارەت بکەیت بە سیفەتەکان لە کاتی باسکردنی ئیشارەتی پێ بدەیت ، بۆ نموونە وەکو ئەوەی رسول الله صلی الله علیه وسلم کاتێک باسی بیستن و بینینی الله سبحانە وتعالی دەکات دەست دەبات بۆ چاو و بۆ گوێیەکانی خۆی ، **دوو جۆرئیشارەتکردنمان هەیە** : ( ١ ) ئیشارەتێک ئەگەر مەبەست پێی ئەوە بێت کە ئەو سیفەتەی باسی دەکەیت ، بۆ نمونە ئەڵێی الله سحانە وتعالی بیسەرە دەبیستێت لەو کاتەدا دەست ببەیت بۆ گوێیەکانی خۆت بەڵام بەم ئیشارەتکردنە و دەست بردنت بۆ گوێیەکانی خۆت مەبەستت ئەوە بێت کە بیستنی الله سبحانە وتعالی وەکو بیستنی مرۆڤ وایە

مەخلوقات وایە ئەمە حەرامە و ئەمە تەمثل ـە وە ئەمە جائیز نییە بۆ الله سبحانە وتعالى بە هیچ جۆرێک....

(٢) بەڵام ئەگەر لە کاتی ئیشارەت کردندا بۆ سیفەتەکە مەبەست جێگیر کردنی سیفەتەکە بێت إثباتی حەقیقەتی سیفەتەکە بێت ئەمە جائیزە ، بۆچی دەست دەبەیت بۆ گوێچکەت لە کاتی کە دەڵێیت الله سبحانە وتعالى بیسەرە یان دەست دەبەیت بۆ چاوت ئەڵێیت الله سبحانە وتعالى بینەرە ئەبینێت یان چاوی هەیە ؟ مەبەستت ئەوەیە کە سیفەتەکە بۆ الله سبحانە وتعالى جێگیر بکەیت ئەگینا مەبەستت ئەوەنیە بڵێی چاوی الله سبحانە وتعالى وەکو چاوی من وایە یان بیستنی الله سبحانە وتعالى وەکو بیستنی من وایە ، کەواتە ئەگەر وتت [ عَيْنُ اللهِ كَعَيْنِي ] چاوی الله سبحانە وتعالى وەکو چاوی من وایە وە ئیشارەتت کرد بۆ چاوت ئەوە تەمثل ـە و باطل ـە لە حەقی الله سبحانە وتعالى خۆمانی لێ بپارێزین ، بەڵام ئەگەر ئیشارەتتکرد و مەبەستت جێگیرکردنی سیفەتەکە بوو بەڵام مەبەستت نەبوو تەمثلی کەیت بیشوبهێنی ئەوە جائیزە و ئیشکالێتێکی تێدانییە .

## بنچینەی سی و یەکەم :

أفعال الرب صادرة عن أسمائه الحسنى وصفاته العلا

واتە : ئەڵێین فعلی اللە سبحانە وتعالی [ دابەزینی ، بەرزبوونەوەی ] اللە سبحانە وتعالی ، سیفاتە [ فعل ] یەکان کە باسمان کرد لە چیەوە وەردەگیرێن لە [ اسماء و صیفات ] ی بەرزو و پیرۆزی اللە سبحانە و تعالی لاوە ، افعال ی اللە سبحانە وتعالی لە اسماء و سیفاتی وەردەگیرێ ، بەڵام للە المثل الأعلی ئەی مەخلوقات ؟ واتە ئەوەی کە باسمان کرد اللە سبحانە وتعالی کاملە اسماء و سیفاتی کەمال ی هەیە ئەو پەڕی بەرزی و بڵندی سیفاتەکانی تەواو کاملن لە هەموو ڕوویەکەوە لەبەرئەوەی سیفاتی [ بەرز ن ] کەواتە کاملە دوواتر کار ئەنجام دەدات یان سیفاتی فعلی هەیە ، بەڵام للە المثل الأعلی بەندە ئەبێت کارەکە ئەنجام بدات ئەو کاتە چی دەبێت ؟ ئەو کاتە کاملْ دەبێت ، بۆ نمونە ئەڵێ عەبدێک ناتوانی لە خۆتەوە بلێی عەبدێک

بەخشندەیە هەتا نەی بینی کە ئەم بەندە کە ئەم کەسە ئەم ئینسانە ئەم مرۆڤە دەبەخشێت بەخشندەی نەبینیت ناتوانیت ، واتە چی واتە فعلەکەی لێ ببینی ئەوکاتە سیفەتەکەی بدەیتە پاڵ ، بەڵام لله المثل الأعلى الله سبحانه وتعالى خاوەنی سیفەتەکەیە وەسف دەکرێت بەو سیفەتە بەرزانە پێش کردنی کارەکە پێش ئەنجامدانی فعلەکە ، کەواتە الله سبحانه وتعالى خاوەنی سیفەتەکەیە کارەکە ئەنجام دەدات ، بەڵام عەبد بەندە فعلەکە ئەنجام دەدات ئەوکاتە وەسف دەکرێت بەو سیفەتە ،کەواتە ئەفعال ی الله سبحانه وتعالى لە اسماء و سیفاتیەوە هاتووە وەرگیراوە ، بەڵام سیفاتی بەندە لەفعلیەوە وەردەگیرێت واتە تاوەکو کارەکە ئەنجام نەدات ناتوانی تۆ بەو سیفەتە وەسفی بکەیت ، بەڵام الله سبحانه وتعالى خاوەنی سیفەتەکەیە خاوەنی سیفاتی کەماله دوواتر کارەکە ئەنجام دەدات ، واتە فعلەکەی لە اسماء و سیفاتی وەرگیراوە جل جلاله .

---

**وصلى الله وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**

---